

# ئاوێنە

١٠٠ کورتیلە چیرۆک

سابیر ڕەشید

◄ چاپی دووەم

بە زیادکردنی لێدوان و وەرگێڕانی کورتیلە چیرۆکەکان

سابیر ڕەشید

# ئاوێنە

## ١٠٠ کورتیلە چیرۆک

**چاپی دووەم**

**بە زیادکردنی لێدوان و وەرگێڕانی کورتیلە چیرۆکەکان**

- ناوی کتێب: ئاوێنە
- ناوی نووسەر: سابیر رەشید
- بابەت: کورتیلە چیرۆک
- تایپ: کاوە حوسێن
- هەڵەبڕی: نووسەر
- دیزاین و بەرگ: ئاکار جەلیل
- چاپ: یەکەم- ٢٠٠٥، دووەم-٢٠١٦
- نرخ: ٤٠٠٠ دینار
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٨٩) ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

▼

# پێڕست

# پێشەکی چاپی دووەم

ساڵی ٢٠٠٥ هەموو کورتیلە چیرۆکەکانی خۆم کە (١٠٠) کورتیلە چیرۆك بوو، کۆکردەوە و حەزم دەکرد لە کتێبێکدا چاپیان بکەم، چونکە زۆر لە نووسەران و بەتایبەتیش برادەرانی وەرگێڕ داوایان لێدەکردم چیرۆکەکانیان بخەمە بەردەستیان، هەرچەندە بە سوپاسەوە زۆریان لەو برادەرانە خۆیان بێ ئەوەی من ئاگادارم لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاودەکرانەوە تەرجەمەیان دەکرد.

ئەوەبوو ئەو خەونەم هاتەدی بە هەوڵ و کۆششی برای ئازیزم دکتۆر شوان سلێمان خاوەن کتێبخانەی سۆران لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی خۆیان ١٠٠ کورتیلە چیرۆکەکانم بە ناونیشانی (ئاوێنە) چاپکرا.

دوای چاپکردنی ئەم کورتیلە چیرۆکانە هەمیسان برادەرانی نووسەر لەبارەیانەوە نووسی و زۆرتریش لەم کورتیلە چیرۆکانە بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕدران و نووسەری بە توانای تورکمانیش حوسام حەسرەت (٢٠) لەم کورتیلە چیرۆکانەی بۆ سەر زمانی تورکمانی وەرگێڕاو بڵاوی کردەوە.

دوای ئەوەی برای بەڕێزم (دکتۆر عادل گەرمیانی) ئەم کتێبەی وەك پێداویستییەکی خوێندنی قوتابیانی بەشی ئەدەب و زمانی کوردی لە زانکۆی کۆیە وەك وانەیەکی پراکتیکی و نموونەی کورتیلە چیرۆك لە ئەدەبی کوردی بۆ قوتابیان و خوێندکاران دانا ئەم کتێبە زیاتر برەوی پەیدا کردو لە کتێبخانەکاندا نەما. منیش بۆ ئەوەی هەم وەك ئەرشیف و هەمیش وەك سەرچاوە حەزم کرد ئەم ١٠٠ کورتیلە چیرۆکانەم جارێکیتر چاپ بکەمەوەو چیدیکە ئەوانەی بەدوایدا دەگەڕێن گلەیی نەبوونیم لێنەکەن، بۆیە بڕیارمدا چاپی دووەمی بە پاشبەندی ئەم لێدوان و لێکۆڵینەوە و وتارانەی لەبارەی کورتیلە چیرۆکەکان نووسراوە بۆ سوودی قوتابیان و خوێندکارانی بەشی زمان و ئەدەبی کوردی زانکۆکانی کوردستان زیاد بکەم، هەروەها

پاشبەندی تریشم خستنە پاڵ کتێبەکە وەك پاشبەندی وەرگێڕانی چەندان لەم کورتیلە چیرۆکانە بۆ زمانی عەرەبی و لێدوان و خوێندنەوەشی هەر بەم زمانە لەگەڵ پاشبەندی وەرگێڕانەکەی بۆ زمانی تورکمانی. هیوادارم شوێنێك لە کتێبخانەی چیرۆکی کوردی پڕ بکاتەوە و جارێکیتریش عاشقانی ئەم هونەرە جوانە چاوەکانیان پێ ڕۆشن ببنەوە.

# چیرۆکی زۆر کورت بۆچی؟

لەگەڵ بوونی جیاوازی بیروڕاو تێڕوانینی جۆراو جۆر لەبارەی ئەم تەرزە چیرۆکە کورتانە، هەست بە بوونی ئەم دیاردەیە دەکرێ وەك جۆرێك لە جۆرەکانی نووسینی چیرۆك، ئەمڕۆکە لە ئەدەبیاتی هەموو دنیادا دەنووسرێ و خوێنەری تایبەتی خۆی هەیە. چیرۆکی زۆر کورت ماوەیەکی زۆر نییە سەریهەڵداوە، هەیە سەرەتای بوونی یەکەم هەنگاو بۆ چیخۆف، یان ناتالی سارۆت، یان بۆ کافکا، یان بۆ گەلێك چیرۆکنووسی ناوداری دیکەی دەگەڕێنێتەوە. بەهەر حاڵ ئەم جۆرە

ئەدەبە نوێیە لە کۆتایی ئەم سەدەیە لە ئەدەبی جیهانیدا سەریهەڵداوەو پاشانیش بەکاریگەری ئەوان لە ئەدەبی عەرەبی و کوردیدا پەیدابووە. هەرچەندە وەك هەقایەت ئەم جۆرە نووسینە لە کوردەواری خۆشماندا هەبووە و شان بە شانی ئەدەبیاتی جیهان بڵاوبۆتەوەو ماوەی دروستبوونی زۆر کۆنە، چونکە هەقایەتی وا کورتمان هەیە گەلێك نزیکن لەم بابەتە نووسینانە، بەڵام شێوەی نووسینی هونەری کورتیلە چیرۆك وەك تەکنیك و جوانکاری و زمان و دارشتنی نوێ لەژێر کاریگەری هەندەراندا چەکەرەی کردووە، تا گەیشتۆتە رۆژی ئەمرۆمان کە سەرەتای نووسینی بۆ سالانی حەفتاکان دەگەرێتەوە، گرنگیش نییە کێ یەکەم هەنگاوی دارشتووە. ئەگەر بیبلیۆگرافیانووسێکی چیرۆك بیەوێ لێی بکۆڵێتەوە دەتوانێ دەستنیشانی ئەم دەستپێشخەریەش بکات. ئەم جۆرە نووسینە لە گۆرەپانی ئەدەبدا وەك شەپۆلێکی نوێ سەریهەڵدا تا خواستەکانی چەرخی خێرایی و گۆرانکارییەکانی تەکنەلۆژیا بە هەوڵ و کۆششی رابەرە پەرۆشەکانی بێنێتەدێ بۆ چرکردنەوەی ئێش و ئازار و ژیانی رۆژانە و گیرگرفتەکانی مرۆڤی هاوچەرخی خاوەن بارە جیاوازەکان و بچووککردنەوەی ئەم هەموو حاڵەتە گەورانە و دارشتنی بەم شێوە نووسینە کورتانە، هەر بۆیەش یەکێك لە چیرۆکنووسە ناودارەکانی عەرەب بە هامبۆرگەری دەچوێنێ، کە زوو هەرس دەکرێ و

یەکێکیدی بە گـوورزی روونـاکی و ئـەوی دی بـە وێنـەی شـیعری و ئەویتریشیان بە وێنەی کاریکاتێری.....تاد. لە پێچواندنی جیاجیا تا دواجار ناوی (قصة قصیرة جداً)ی بۆ دانراو زۆربەیان لەسەر ئـەم نـاوە رێککەوتن، بەڵام تا ئێستا ناوی ئەم جۆرە چیرۆکە لە ئەدەبی کوردیدا جێگیر نەبووە، بەڵکو ئەم ناوانەی لێنراوە (چیرۆکی ئێجگار کـورت)، (کورتیلـە چـیرۆك)، (چـیرۆکۆکە)، (چـیرۆکیلە)، (رۆژانـە چـیرۆك)، (سەرنجە چـیرۆك)، (پۆسـتەرە چـیرۆك)، (چـرکە چـیرۆك)، (خونچـەی چیرۆك)، (میکرۆ چیرۆك).....تاد، بـە پێچـەوانەی رای هەنـدێك بـرا چیرۆکنووسەکانمان نووسینی ئەم تەرزە چیرۆکانە پێویستی بە تەقـەڵای بەردەوام و ئاگاداری چیرۆکنووس هەیە لەسـەر رۆشـنبیری جیهـانی و ئاگاداری لە پەرەسەندنی بەردەوامی هونـەری و دارشـتنی زمـانێکی چـڕوپڕ و شـیعری و جـوان بـۆ چـڕکردنەوەی حاڵەتـەکانی مـرۆڤ بـە زمانێکی سادە و جوان و دەربڕینی وێنە و رستەی کورت و پـڕ مانـاو شێوە نووسینی تـەکنیکی هاوچـەرخ. هەنـدێ کـەس هـەن لایانوایـە چیرۆکنووس دەتوانێ رۆژانە چەندان لەم چیرۆکانە بنووسێ وەك ئـەوەی نوکتە و قسەی نەسـتەق و خـاتیرە بنووسـێ بـێ زیـادو کـەم، بـەڵام هونەرکاری ئەم شێوە نووسینە زۆر قورسترە لە نووسـینی چـیرۆکێکی ئاسایی ئەمەش زۆر لە گەورە چیرۆکنووسان دانیانپێداناوە.

گرنگ ئەوەیە لەکاتی خوێندنەوەی چیرۆکی زۆر کورتدا چەند سەرنج و تێبینییەك لای خوێنەر دروست بکات، کە لە خوێندنەوەی سەرەتای چیرۆکەکە خوێنەرەکە بۆ خۆی رابکێشێ و هەست بەوە بکات شتێك روودەدات، یان لە کۆتایی چیرۆکەکە گۆورزێکی گەورە بوەشێنێ و خوێنەر تووشی سەرسوورمان بکات، کە چاوەڕوانی ئەم کۆتاییە کتوپڕەی نەدەکرد، رەنگە زۆرجاریش کۆتاییەکەی بۆ خوێنەر بەجێبهێڵرێ، کە ئەو کۆتاییەکەی دابنێ، یان چیرۆکنووس بەیەك رستەی چڕوپڕ دەتوانێ شتێك بداتە خوێنەر و وایلێبکات بیر لە سەرەتاو کۆتایی و مەغزای چیرۆکەکە بکاتەوەو بەشداری چیرۆکنووس بکات. ئەم تەرزە نووسینە خۆی لە خۆیدا جۆرە هەنگاوێکە بۆ دروستبوونی ئەدەبێکی پێشڕەو نوێخواز کە دەتوانێ وەك شیعری هایکۆ و پۆستەرە شیعر بۆ چەرخی مرۆڤی جەنجاڵی ئەمڕۆمان بنووسرێ و ببێتە بنەمایەك بۆ ئەدەبی چەرخی نوێ و مرۆڤی نوێ و رۆشنبیری هاوچەرخ، ئەو مرۆڤەی، کە دەیەوێ لە کورتترین ماوەدا جۆرە نووسینێکی بە سەلیقە و نوێ بخوێنێتەوەو مەغزاو بۆچوونەکانی چیرۆکنووس شیتەڵ بکاو حاڵەتە مرۆڤایەتییەکان بە کورتکراوەیی وەرگرێ و لە مێشکی خۆیدا تەکانی پێ بدات، یان هەر هیچ نەبێ شتێکی لەلا دروست بکات.

من هەرگیز لەگەڵ ئەو زاتانە دانیم کە چیرۆکی زۆر کورت بە چیرۆك لە قەڵەم نادەن. هەربۆیەش بایەخدانی من بۆ ئەم تەرزە چیرۆکانە جۆرە عەشقێکی شێتانەی بەخۆوە گرتووە، چونکە گەلێك حاڵەتی مرۆڤایەتی گەورە هەن رۆژانە دەیبینین، یان هەستی پێدەکەین و دەتوانرێ بە کورتی و خەستی بدرێنە خوێنەر و پێویست بە درێژدادڕی ناکات و پێویستە ئەم نووسینانە بە وێنەی هونەری کورت و جوان دیمەنی چیرۆکی کوردی وەك بەشێك لە ئەدەبیاتی هەموو دنیا برازێننەوە.

دەبینین زۆرجار شاعیرەکانیشمان ئەم وێنە شیعریانە بە پۆستەرە شیعرێك، یان بە چوارین، یان دوو بەیتی دەردەبڕن رەنگە زۆربەشیان چیرۆك ئامێز بن و ئەگەر بە چیرۆك بنووسرێنەوە رەنگە ببنە چیرۆکی زۆر کورت، جا بۆچی ئەوەی بۆ شیعر رەوایە بە کورتکردنەوەی ئەم حاڵەتە گەورانە بۆ چیرۆکیش رەوا نەبێ؟ جا لەبەر ئەوەی ئەم چیرۆکانە ئاسانترین رێگانە بۆ گەیشتن بە مێشکی خوێنەر من لای خۆمەوە بە پەسەندی دەزانم و بە شەوقەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەم و ناتوانم لە سیحری ئەم رەنگە نووسینە دەربازبم، با هەبێ ئەم شێوە نووسینی چیرۆکەش کەلێنێك لە ئەدەبی کوردی پڕدەکاتەوەو بوونی سوودمەندترە لە نەبوونی.

## ئاوێنە (١)

ئەم ئاوێنە بچکۆلانەی بەر باخەڵم، قەت هەڵە ناکات، هەمیشە وێنەی مردووی خۆم نیشاندەدا.

## ئاوێنە (٢)

کە لـە ئاوێنـە شـکاوەکەی بەرانبـەرم سـەیری دەوروپشـتی خـۆم دەکەم، هیچ کەسـێك بـەدی ناکـەم، شـارێکی تـەماوی و خـامۆش. خەڵکی بینە قاقـای مـەرگ. ناکـەس بەچـەکان دەبینـرێن پردێکیـان لەسەر ملی خەڵکی کردووەو لەم سەرو ئەو سەری شار تەراتێن دەکەن و میز بە ئاوێنەکەدا دەکەن.

## ئاوێنە (٣)

کەللە سەرێك لە ئاوێنە ڕەنگاویەکەدا، دایە قاقای پێکەنین.. دایە گریان.. لە شەهیدبوونی خۆی پەشیمان بووەوە.

## ئاوێنە (٤)

ئەم مەملەکەتەی ئێمە هەر جێگایەکی هەڵیدەیتەوە، هەمووی هەر گۆڕستانە.. کیمیاباران کراوەکان.. ئەنفالکراوەکان... کوشتاری دەست دزو و جەردان... لە ئاوێنە شکاوەکانی ناو گوفەکان ڕۆژێ سێ جار کەللەسەرەکانیان چاوشارکێ لەگەڵ یەکتر دەکەن.

## ئاوێنە (٥)

دوای خۆرگیرانەکــە... هەنــدێك بەدەســتی ئــاڵاوە بــە چــیاکەدا هەڵدەگەڕان.. هەندێکیتر ئاڵای جۆراوجۆریان هەڵگرتبوو و لــە بنــاری چیاکە بارگەیان لێخستبوو... هەندێك سکی خۆیان گرتبوو و بــەدوای کاروانی مردووان کەوتبوون... تــاقمێکیتریش بــەدوای ســیحربازێکدا دەگەڕان زەمەنیان بۆ بگەڕێنێتەوە دواوە... بوو بە چــڕ دووکــەڵ، لــە دەلاقەکانی دەوروبــەر، ژەدیهــا ژەهراوییــەکان، چــاوەڕوانی ئــەنجامی یارییەکە بوون... خــەڵکی گەڕەکەکــەم تێکبــەربوون، لافــاوی خــوێن کەللەسەری رادەپێچا... ئاوێنەکان خڕبوونەوەو لە حەژمەتان بوون بــە مێژوونووس.

## ئاوێنە (٦)

لە مردووستانەکەدا دەم نادەم بنیادەمێکیان بە خەڵتانی خوێنــەوە گلۆر دەکردەوە، تا دەهات لاشەکان لەسەر یەکتر کەلەکــە دەبــوون... لــە گۆشــەیەکی ئاوێنەکــەدا دیــتم... پاســەوانانی شــار لەگــەڵ دز و پیاوکوژەکان پێکەوە دامەیان دەکرد.

## ئاوێنە (٧)

منـــاڵانی شـــارەکەم وردە ئاوێنـــەکانیان کـــۆکردەوەو نەخشـــەیەکی تازەیان لێ دروستکرد... ڕمبازەکان هاتن (مردووســـتان)یـــان لەســـەر نووسی و کردیان بە وانەی جوگرافیا.

## ئاوێنە (٨)

پێش ئەوەی بەرەو دەوام بکەوێتەڕێ سەعاتێك لەپێش ئاوێنەکە خەریکی قژ ڕێکخستن و ماکیاج و تیف تیفە بوو... لە ئاوێنەی ماشێنەکەش هەر دەیڕوانییە وێنەی خۆی و سەرو قژی ڕێکدەخستەوە... کە گەیشتە بەردەم دایەرە، جانتاکەی دەستی کردەوەو بە ئاوێنەکەی ناوی دیسان سەیری خۆی کردەوە.. کە گەیشتە ژوورەکەی خۆشی لە ئاوێنەی ژوورەکەیدا دیقەتی خۆیداوە، ئەمجارە خۆی بە بەرواژی دیتەوە، وێنەیەکیتری خۆی بوو.

## ئاوێنە (٩)

لە ئاوێنەی ئۆتۆمبێلەکەدا دیقـەتی رۆیشـتنیان دەدا.. لـە ناکـاو پەلەواژیان کردەوە... عەلاگەیەکی رەش کە تاقە بلـوزێکی لەنگـەی تیابوو، ژمارەیەکیتری لە داستانی پیاوکوژان تۆمارکرد.

## ئاوێنە (١٠)

خۆم دانەواندەوە، ئاوێنەکەی ناو باخەڵم لێکەوتە نـاو زێرابەکـەوە کە شۆڕبوومەوە ناوی دەربیبێنم، سەیرم کرد جیهانێکیتر بوو.. خەڵکی ئەوێ گۆشتی سـەگیان دەخـوارد.. لەگـەڵ خوشـك و دایکـی خۆیـان جـووت دەبـوون... زەلامیـان وەك چـۆلەکە سـەردەبڕی... دزو جەردەکانیان لەباتی گیران خـەڵات دەکـران.. نـەدارەکانیان لـە دیـار مێزی رازاوەی گەورەکان تێر دەبوون... باش بوو زۆر لەوێ نەمامەوە، کە ئاوێنەکەم دۆزییەوە بە هەڵەداوان هاتمە دەرەوە... دەنا شتی سەیر و سەمەرەتریشم بۆ دەگێڕانەوە.

## ئاوێنه (١١)

بـــه دوو بـــرا خـــانووێکی ســـاکاریان بینـــاکرد... هەرخۆشـــیان دەستیاندایه کەرەستەی رووخان و له رقی یەکتر تێکیـان دەدا.. بـاش بوو پێش ئەوی تێکبچیٚ ئاوێنه رەنگاورەنگەکان بوون به کاریته.

# ئاوێنە (١٢)

((دایك و منداڵە ساواکەی، لـە تەنەکـەی بـەردەم چێشـتخانەکە دەلەوەڕان)) ئەم وێنەیەم لە پشتی ئاوێنـە خڕەکـەی باخـەڵم کـردەوەو خستمە ناو نامەیەك و بە باڵی کۆتر بۆ ڕۆژنامەیەکی هەندەرانم نارد.

## ئاوێنە (١٣)

دوێنی خەڵکی شارەکەم لە سێبەریشی دەرەوێنەوە... ئەمڕۆ دۆستە و بجووڵێتەوە وەك نەهەنگ سەدان کەس لەبن دەست و قاچیدا دەپلیشێنەوە... کە مەملەکەت بوو بە شەوەزەنگ، ئەویش بوو بە پاڵەوانی شەڕو خەڵاتەکەشی کورسییەکی زێڕین بوو.

## ئاوێنە (١٤)

رۆژنامەنووسە بیانییەکە کە گەیشتە بازاڕی شێخەڵا، کامیراکەی خستەکار، وێنەی جۆراوجۆری دەگرت.. خەڵکەکە لە خۆشیان شاگەشکە بوون... بۆ ئەوەی وێنەکانیان دەربچێ، دەستە دەستە دەهاتنە پێش کامێراکەی... هەر هێندەم زانی خەڵکی شار هەموو رژانە ئەوێ.. بوو بە شایی و دۆڵ و زوڕنا.. هەموو هاتن بۆ ئەوەی ئەم ئاهەنگە خۆشە بە خەڵکی رابگەیەنن.

# ئاوێنە (١٥)

زۆرم نەمابوو بگەمە سەر ترۆپك.. هێشتا بەردەكەم لەسەر پشت بوو... لەناكاو بەرپێنەیەكم درایێ.. كەوتمە ناو چالێكەوە، بەردەكە كەوتە سەر جەستەم.. بە خاكەوە نووسام... دالاشە برسییەكان نێچیری خۆیان دەستكەوت، لە دەورم دەسووڕانەوە، لە دیارما هەلتڕووشكان.. چاوەڕوانی ئەوەبوون لەبن بەردەكە بێنمەوە.. كە هاتمە دەرەوەش شالاوی مەرگم بۆ بێنن... هەلۆیەكی گەورە هات بەردەكەی لەسەر لادام و وەك جاران خستییەوە سەرپشتم، لە چالەكە دەریهێنام و نان و ئاوی دامێ... تۆزێك پشووم هاتەوەبەر.. هەنگاوم هەلێنا نەدەگەیشتمە جێ... كاتێ لە ترۆپك نزیك دەبوومەوە، هەلۆكە ڕێی بەدالاشەكان دەدا بەردەكەم لەسەر پشت فڕێدەن و بۆ ناو چالەكە گلۆرم بكەنەوە... دیسان وەك جاران بەردەكەم بە كۆل دادەدرایەوە... سەیری ئاسمانم دەكرد یەك پارچە بوو بووە ئاوێنە، كەچی بەردەكەی سیزیف هەر لەسەر پشتی من بوو.

## ئاوێنە (١٦)

هەموو ڕۆژێك ئاوێنەیەكی نوێم دێناو لە دەرگـای قـەڵام دادەنـا.. خەڵكی شارەوكەم پێـی بەختـەوەربوون... شـەوان ناكـەس بەچـەكان دەیانشكاند... لەبەر ئەوان چیتر نەوێرام بەم ناوەشدا بچم... سـێرەیان لێگرتبوو، ئەوەی لـە قەڵاكـەش نزیـك دەبـووەوە خـەڵتانی خوێنیـان دەكرد.

# ئاوێنە (١٧)

کورتترین چیرۆکی کوردی تا ئێستا خوێندبمەوە ئەوەبوو ((دایە گیان خواحافیز!!))ی ڕەزا سەید گوڵ بوو، منیش دەمەوێ لەو برادەرە کورتتر بنووسم، بۆیە دەبێ بڵێم ((دایە!!)).. یان بڵێم ((خواحافیز)).. یان ((بای بای))، بەدڵم نەبوو بۆیە بیرۆکەیەکم بۆ هات کە بڵێم: ((دایەگیان خواحافیز!! بەڵام بۆ هەندەران!!)).. کە سەیرم کرد لە چیرۆکەکەی ئەو برادەرە درێژتر بوو... بۆیە بڕیارمدا کە هەر لەم ڕستەیە سەرەتای پیتەکان هەڵبژێرم، ئەوسا چیرۆکەکەم بەم شێوەیە دەبێت ((د. خ. ب. هـ!!)) ئیتر نازانم خوێنەران ئەم مۆدیلە چیرۆکەم لێوەردەگرن، یان نا... ڕەخنەگران حیسابی وردترین چیرۆکی کوردیم بۆ دەکەن، یان نا..

**تێبینی:** ئەگەر کرا وێنەی فڕۆکە و کوردێکی سەر بە شەبقەم بۆ بکەن بە ناونیشانی چیرۆکەکە و ئاوێنەکەی بازاڕی شێخەڵڵاش لەسەر سەری بێ و بای بای لێ بکات بۆ هەندەران.

## ئاوێنە (١٨)

لەسـەر کورسـییەکەیدا تەماشـای خـۆی دەکـرد بینـی هێشـتاکە بچـووکە، بۆیـە کورسـییەکانی شـوێنی کـارکردنی خـۆی هـەموو کۆکردەوەو وەك سۆپەرمانێك جلیتبازی لەسەر دەکردن. هێندەی نەبرد بەهۆی شکانی پێچکەی کورسییەك کەوتە خوارەوە.. هـیچ دکتۆرێـك چـارەی نـەکرد و نـەیتوانی جـارێکی دیکـە ببێتـەوە سـۆپەرمانی کورسییەکان.

## ئاوێنە (١٩)

لەناو گۆڕەکەیدا بۆ بەختی خۆی دەگریا، چونکە کە بەڕێیان کرد لە چەند خزم و کەسێکی بترازێ کەسی دیکە لـەوێ نـەبوو... لـەو دنیاش بە غەریبی بە خاك سپێردرا کەچی مردووەکـەی بەرانبـەری سـەدان پلـەدار و پاسـەوان و کاسـەلێس و بەسـەدان ئۆتـۆمبێلی گرانبەها ئاپۆڕەیان لە دەوری گۆڕەکەی بەستابوو.

## ئاوێنە (٢٠)

سەیری هەر ئاوێنەیەکی دەکرد وێنەی خۆی بەسەراوژێری دەهاتە پێش چاو.. سەری لێ سوورمابوو نەیدەزانی نە ئەو لێی تێکچووە نە ئاوێنەکان وای پیشاندەدەن.. بوو بە دوژمنی ئاوێنە، لە هەر شوێنێك بیدیباو نیشانیان بدایە دەیشکاند.. پشتی لە ئاوەدانی کرد تا چیتر چاوی بە ئاوێنەکانی شار نەکەوێتەوە.

## ٢١- شەمەندەفەر

سواری شەمەندەفەرێك بوو.. لەكاتی دابەزینی دا سەیری كرد كەللەسەری خۆی لە یەكەم وێستگەدا ون كردووە.. ناچار بە هەمان رێگادا گەڕایەوە شوێنی یەكەمجار.. تا كاسە سەری خۆی بدۆزێتەوە.

## ٢٢- تابلۆیەك

لە پێشانگاکەدا گوریسی خەیاڵی ئالۆزکا.. کەلای چاوەکانی لـەم تابلۆیە چەقین کە دیمەنەکەی ئەمـە بـوو: کابرایـەکی نیـوە مـردوو.. خەنجەرێکی ژەهراوی بە سەرکیدا روو چـووبووە خـوارەوە.. جەسـتەی هیلاك و ماندووی لە خوێنا شەلاَل بوو بوو.. ئەگـەر تابلۆکـە گیـانی لەبەر بووایە، باوەشی سۆزی پێدا دەکرد و پێیدەگوت: ((بابـە منـیش وەك تۆ ئەم رێگایە سەختە دەگرمەبەر!)).

## ٢٣- داربەڕوو

لەبیرمە جاران کە منداڵ بووم دەچووین لە دار بەڕووەکانی قەدپاڵ چیا باخەڵی خۆمان پڕ دەکرد.. کە دەهاتینەوە لەناو ئاگردانی ماڵەوە دەمانبرژاندن و لە خواردنی تێر نەدەبووین.. پاشان کوڕی زۆرداری گوند ئەم رێگایەی لە ئێمە قەدەغە کرد.. کە گەورەبووین هەستمان پێکرد کە ئێمەش بەشمان هەیە، کەچی کوڕی زۆرداری گوند سووتاندنی و بوو بە خەڵووز.. کاتێک گوندەکەمان ئاوەدانکردەوە، درەختەکانیش لەگەڵیدا چرۆیان دەکرد.

## ٢٤- گەشتێکی خەیاڵی

نووسەرەکە دوای ئەوەی (کۆمیدیای خوداوەندی) دانتی خوێندنەوە.. ئیجگار ماندوو بوو.. بۆیە لەگەڵ کتێبەکەدا دەستلەملانێ خەوی لێکەوت.. ئەو نووسەرە شەو لە خەویدا بوو بە (دۆن کیشۆت)ێك و سواری ئەسپە شێیەکەی بوو و ئەم سەرو ئەو سەری دنیای تەی دەکرد.. بەردەوام لە ئەستێرەو خۆر و مانگی دەپرسی و بەدوای ئەم جیهانە ونەی دانتیدا دەگەڕا.

## ٢٥- خانوو

کابرا هەموو حەز و ئارەزووی ئەمەبوو کە ئەم خانووە بچکۆلانەی تێیدا دەژیا لە خاوەنەکەی بکڕێتەوەو ببێتە خاوەنی یەکجاری و خۆی سەروەری ماڵەکەی بێت.. چەند ساڵێك بوو مووچەکەی پاشەکەوت دەکرد وگەلێك شتی ماڵەوەشی فرۆشت.. سەرەنجام خەونەکانی نەهاتەدی و وەك جاران بە کرێچییەتی مایەوە... ئیتر ئێوە خۆتان هەریەکەو هۆیەکی بۆ دابنێن، لای من گرنگ ئەوەیە کە لە ئەنجامدا وابکەوێتەوە: یان کابرا هەمیشە بە خەونی دەستکەوتنی شوێنی حەوانەوەیەکدا دەژی یانیش هەراجخانە و بۆ هەندەران.

## ٢٦- کەپر

خێزانێـك لەبـەر دوژمنـداری ئـاوایی خۆیـان بەجێهێشـت.. لـە شـوێنێکی دوور گیرسـانەوەو کـەپرێکیان بینـاکرد.. دوای ماوەیـەك دوژمنەکانیان بەسەریاندادان، بەڵام ئەوکاتی پیاوەکانیـان لەوێنـدەرێ نەبوون.. ئەمانیش بەخۆڕایی نەگەڕانەوەو ئاگریان لە کەپرەکە بەردا.. ئەمـە جـاری چـەندەمیان بـوو کـە مـاڵ دروسـت بکەنـەوەو لێیـان تێکبچێت.. بۆیە بڕیاریاندا ئیتر بن بـە ئێشـکگری گیـانی خۆیـان و کەپرەکەیان.

## ٢٧- کولیلك

دالاشـــە برســـییەکان چـــڕنووکیان لـــە گیـــانی مرۆڤێـــك گـــرت و لاشەکەیان هەموو خوارد، تەنیا ئێسکی مایەوە... ئەو خوێنە پـــاك و بێگەردەی لە زەویەکەدا رووچووە خوارەوە... دوای چـــەند ســـاڵێك لـــە هەمان جێگای لاشەکەدا کولێلکێك بەدەم خۆر دەگەشایەوە.

## ٢٨- هەڵوێست

منداڵە گوڵەبەڕۆژە فرۆشەکە خلیسکێکی بردو قاپەکەی لە دەست بەربووەوەو جلەکانیشی پیس بوون.. دەستی کرد بە گریان..

- بۆچی دەگریێی؟

- باوکم لە ماڵەوە لێمدەدات.

- دەبڕۆ جلەکانت پاك بکەرەوەو ئێمەش پارەی گوڵەبەڕۆژەکەت بۆ خڕدەکەینەوە.

- نا.. نا.. باوکم هەر لێمدەدات.

زۆر هەوڵیان لەگەڵیدا کەچی ئەو هەر دەگریا.. دواجار بە هەنسکی گریانەوە وەها دوا:

- بۆچی باوەڕم پێناکەن، ئەو زاڵمە هەرچی بکەم هەر تێمهەڵدەدات بەتایبەتی ئەگەر هەموو ئێوارەیەك پارەی عارەق و مەزەکەی بۆ مسۆگەر نەکەم.

- دەوەرە بائێمە پارەکەت بۆ گردەوەکەین نەبادا لە ماڵەوە وەدەرت بنێت..

تۆزێك داما.. مت بوو.. پاشان هەڵوەستەیەکی کردو بەگریانەوە بۆی خشی.

## ٢٩- تەلیسم

هەبوو نەبوو پاشایەك هەبوو.. ئەو پاشایە چەند ساڵێك بوو فەرمانڕەوایی خۆی بە ئاگر و ئاسن پۆلاڕێژ کردبوو... ڕۆژێکیان لەژێر پەیکەرێکی گەورەی خۆیدا سەری بەسەر گۆچانەکەی دەستییەوە کردبوو لە جێوە مردو لە شوێن خۆی ڕەق بووەوە... چەند ساڵێك بوو کەسێك نەدەوێرا لێی نزیك بکەوێتەوە، بۆیەش دەسەڵاتداری هەر بەناوی ئەوبوو.. وەك بڵێی تەلیسمی لە خەڵکەکە کردبێت کەسێك نەدەوێرا بە مردوییش ناوی بهێنێت ئەگینا لە سەریان دەدا.. تا شارە مۆرانە بە گۆچانەکەیدا هەڵگەڕاو دارەکەی رزی و لاشەکەی بۆگەن بوو و کەوتە سەر زەوی.. ئینجا زاتی ئەمەیان کرد کە بڵێن مردووەو ناویان لە لاپەڕەی مردووە ترسناکەکان تۆمار کرد. ئەوسا ڕەش و رووت کردیان بە ئاهەنگ و کردیان بە جەژنی رزگاربوون.

## ٣٠- بەراورد

سـەیری تەلـەفزیۆنی دەکـرد... بینـی سـەگێك لەگـەڵ پاڵـەوانی فیلمەکە خۆ دەگەوزێنن و دەست لـەملانێن.. پاشـان پێکـەوە نانیـان خوارد و نووستن و خۆشیان شووشت.. کە بەرەو ماڵ گەڕایـەوە دیتـی زەلامێـك لـەناو گوفەکێکـدا خلتـانی خـوێن کـراوە.. شـەوێ هـەتا خەویشی لێکـەوت بـەردەوام ئـەم دوو دیمەنـەی لـە مێشـکی خۆیـدا بەراورد دەکرد.

## ٣١- هەڵە

بەناو قەڵەبالغی خەڵکەکەدا دەڕۆیشت... لەناکاو گوللەیەك پێکای و خلتانی خوێن بوو... بە هەڵە ئەوی گرتەوە... ئەوە کابرایەك بوو ویستی دوژمنەکەی خۆی بکوژێت، بەڵام ئەوبوو بەو نێچیرەو نانی سەردەستەکانی و خوێنی ناو لەشی و خۆڵی سەر شۆستەکە هەموو تێکەڵی یەکتری بوون.

## ٣٢- باڵندە

هونەرمەندەکە دوای ئەوەی تابلۆکەی تەواو کرد ئێجگار هیلاك بوو بۆیە ژووری وێنەکێشانی بەجێهێشت.. لەملاوە کوڕەکەی کە هەمیشە بەدیار باوکییەوە دادەنیشت و بە قەڵەم لاسایی دەکردەوە... ئەمجارە بە پێچەوانەی باوکی تابلۆکەی ئاوەژوو کردەوە.. ئەم باڵندەیەی کە باوکی لە وێنەدا خستبوویە ناو قەفەز، ئەو خستییە سەر چڵی درەختێکی سەوزی قەدپاڵ چیایەك.. کە باوکی هاتەوەو چاوی بە وێنەکەی کەوت دەستخۆشی لێکرد.. بەڵام ئەو راوچییەکی بۆ زیادکرد بە ساچمەکەی دەستی باڵندەکەی بریندار کردبوو.

## ٣٢- شوفێر

شوفێر تاکسیەکە لەبەر ئەوەی زۆر پیاوێکی بەخشندە، میهرەبـان بوو، لەبەردەم دوو پیاو و ژنێك وەستا.. بە چوار دەستە ژنەیان خستە ناو ماشێنەکە و داوایان لێکرد بیانبـات بـۆ نەخۆشـخانە، بـەڵام کـە گەیشتنە شوێنێکی لابەلا یـەکێکیان لـەو دوو کەسـە دەمانچـەکەی خستەکار، ژنەکەش وازی لـە تەمسـیلکردن هێنـاو بـە هەرسـێکیان کابرایان لە پەلوپۆ خست.. سـەرەنجام شـوفێری بەسـەزمان بـەجۆرێك خۆی دیتەوە بێ ئۆتۆمبێل، بێ پارە، بێچارە، سەرگەدان و ماڵوێران.

## ٢٤- ڕێگا

دایکی کە بەڕێی کرد هەر ئەوەندە ئاگای لێبوو کە لە نێوان چواڕیانەکەدا لەبەر چاوان ون بوو.. چیلێهات! بەرەو ئاسمان هەڵکشا؟ یانیش زەوی قووتیدا؟ نەیدەزانی دەگەڕێتەوە، یان نا؟ دەمرێ، یان خۆر لە باوەش دەگرێت؟... بۆیە هەموو بەیانییەك لەگەڵ کازێوەدا چاوی دەبڕیە ئاسۆ و دیقەتی خاڵی بەیەکگەیشتنی چواڕیانەکەی دەدا، بەڵکو ئێ کوڕیە خێر نەدیوەکەی بۆ بگەڕێتەوەو جارێکیتریش بە دیداری شادبێتەوە.

تێبینی:- ئەو پیرە دایکە تا کاتی نووسینی ئەم کورتیلە چیرۆکەش هێشتا هەر لە ژیان دایە و چاوەڕێی گۆدۆیەکیتر دەکات.

## ٣٥- جیاوازی

بــەناو قەڵــەباڵغی خەڵکەکــەدا چــووە ژوورەوە.. چــاوی بــە هەموولایەکدا دەگێڕا تا لــەم ســەری هۆڵەکــە دۆزیــەوە.. زۆربــەیان بەدیاریەوە وەستابوو.. ئەمیش بێناگا لەنێو جێگاکــەی.. دڵــی بــۆی کڕووزایەوە.. هەناسەیەکی نا ئومێدی قــووڵی هەڵکێشــاو لــە نــاوەوە خۆی دواند... خۆزیا بەم شێوەیە نەمدیبا کە ئەم پەیکــەرە ڕەنگینــە وەك خەڵووز سیمای شیرینی داپۆشــێت.. ئــەوەتانێ مێردەکــەی وەك کێل بە سەریەوە وەســتاوە.. واچــاکە مــن نەچــم و هــەر لــە دوورەوە سەیرێکی بکەم و لە دڵەوە بۆی بگریم... ئەوەتانێ دایك و باوکیشــی شینیان بۆی داناوەو لــە چــۆکی خۆیــان دەدەن، ئــەدی بۆچــی ئەوســا نەیانهێشت مــن و ئــەو پێکــڕا هێلانــەی خۆشەویســتیمان چــێکەین، چونکە من وەك ئەو مێردەی سامان باخەڵی هەڵنەدەتەکاندم وەلێ خۆ لە خوێنەدەواریدا مێشکی من قەبەتربوو... کەچی ئەویان خستە نــاو کەژاوەی بووکێنی.. دەسا بیخۆن و پەنجــەی پەشــیمانیتان بگەزنــەوە، پێمنالێن ئەم پوولانە ئەم برینە سەختەیان چــۆن پــێ ســاڕێژ دەکــرێ، چۆن ئەو مردنەیان پێڕادەگیرێت.

بۆ دواجار لە دوورەوە سەرنجێکیتری دایێ و وێنەی پڕی چـاوەکانی خۆی کرد.. بە ناچاری لــە قاوشــەکە چــووە دەرەوە.. بــەڵام بــە دڵ و ویــژدانێکی زینــدوو، بــە خــاوەنی دڵێکــی دزراو، بــە ئــاواتێکی لــە گۆڕنراو، بە بیرو لێکدانەوەی بــەردەوام بــەرەو چارەنووســێکی نادیــار هــەنگاوەکانی یــەك لــە دوای یــەك ســـــتر دەبــوون... وردە وردە شەقامەکان قووتیان دەدا و بچووکتر دەبووەوە.

## ٣٦- دابڕان

خـــۆی و جووتـــە شـــەقرەکەی بـــەناو دالآن و کەلەبـــەرەکانی نەخۆشخانەدا دەگەڕا... چەندان بیرۆکەی سەیر ختووکـەی مێشـکیان دەدا.. بەردەوام چاوەڕوانی بڕیاری پزیشکیّ بوو... ئـیّ ئەمـە خوایـە دەری بکات و بینایی بـە چـاوە نازدارەکـانی خۆشەویسـتەکەی روون بێتـــەوە، هەرچـــەندە ماوەیـــەکی زۆریـــش بـــوو هـــیچ هـــەواڵێکی پێنەگەیشتبوو.. بەڵام قەتیش بە خەیاڵیدا نەدەهات و وەکو دوو دڵدار ناوی لـە فەرهـەنگی خۆشەویسـتیدا بسـڕنەوە.. هـەر بـەم خەیاڵانـە گەیشتەوە لای قاوشەکەی خۆیان و یەکسـەر بـە هـەواڵی مـارەبڕینی کەژاڵ خوێن لە لەشیدا نەماو رەق هەڵگەڕا.. ئەوکاتی هەستی بەمـە کرد کە بڕینەوەی قاچەکەی وای خستۆتە بـیرو لێکدانـەوەی کـە تـازە نیوە مرۆڤێك بە کەڵکی هاوسەرێتی نـەماوە.. بۆیـە چـیتر لەنگـەری نەگرتووەو ئەم بڕیارەی داوە.. ئەویش لەوسـاوە تاسـاوە، بێهـوودەیی زمانیشی لال کردووە هەتا بە جوولانەوەی رادەگات.

## ٣٧- پێوانە

گەلێك جاران وای بە بەرگوێ دەکەوت کـە ئەگـەر ئۆتۆمبێـل لـە یەکێکیدا و نەمرد، ئەوا ئەو کەسە بەختەوەر دەبێت و دەبێتە خـاوەن سامان. هەر ئەم خەیاڵە ئـەمجارە بەڕاسـتی گەیاندییـە ڕێکـەوتی ئەوەی وەبەر ماشێن بکەوێت.. ئەگەرچی کەم ئازاریش بوو، بەڵام بـە تەواوی هۆشی لەخۆی بڕی تا دڵنیا بوو لـەوەی لەگـەڵ قەرەوێڵەکـەی خەستەخانە جووت بـووە... دوای مانـەوەی دوو ڕۆژ... پزیشـکەکان ڕاپۆرتی خۆیان نووسی و دەریانکرد و شوفێرەکەشـیان بـەردا.. بـەڵام ئەو هەر بەم خەیاڵە دەخولایەوە کە پارێزەرێ ئەگەر بە نیـوەیش بێـت ئەو تەئمینەی بۆ وەرگرێت و لە کرێچیاتی ڕزگاری بکات.

## ٣٨- ئۆتۆمبێل

چەند ساڵێك بوو لە دەمی خۆی و منداڵەکانی دەگرتەوە، تـا بـڕێ پارەی خستەسەر یەکتر و هاوسەرەکەشی ئاڵتوونی خۆی بۆ فرۆشـت.. بوو بە خاوەن بۆرە ئۆتۆمبێلێك.. ئەوەنـدەی خۆشدەویسـت هەمیشـە پاکی دەکردەوە.. زۆری نەبرد بـوو بـە پـارووی چـەوریێ ڕێگرەکـان.. هـەموو ڕێگایـەکی گرتبـەر: سـەردانی لێپرسـراوان، سـەردانی جادووگـەران، سـیکرابخانەو بـازاڕی دزان.. کەچـی بنگـۆم بـوو و شوێنەواری دیار نەما.. ئەوەنـدەی قـازانج بـوو شـەوان لـە خەونیـدا سواری دەبوو و خێزانەکەی پێدەگێڕا.

## ٣٩- کۆچ

منداڵان گۆڕەپانەکەیان کردبوو بە یاریگە.. لە کاتی یاری کردنـدا یەکێکیان لەملاوە سـەرنجی گۆیەکیـدا لـەژێر تەپۆلکـە خۆلینەکـەدا دەریهێنا و منداڵەکانی تری بانگ کرد.. نەیانزانی چـییە. یـەکێکیان ویستی ئەڵقەکەی رابکێشێت.. ئـەم پـرِی دایـێ و ئـەوەیتر لـەم لاوە دەیرِفاند.. تا لەپرِ لەگەڵ دەنگی تەقینـەوە هەریـەکێکیان بەلایەکـدا کەوتن و خەڵکی دەورەیاندان و پێکەنین و رۆندکیان پێکـەوە تێکـەڵی خۆڵی گۆڕەپانەکە بوو.

## ٤٠- پاڵتۆ

لە بەیانییەوە تا ئێوارە پاڵتۆکەی خستبووە سەر دەستی، کەسێك هیچی پێنەدا.. چاری نەبوو تا بەرەولای کۆنەفرۆشەکان پێچی کردەوەو کابرایەکی بیانی بینی.. بە دەست، بە چاو، بەسەر، هەرچۆنێك بوو تێیگەیاند کە بۆی بفرۆشێت و بەشی ئەویش مسۆگەرە... هەر بە چاو قوچانێك پاڵتۆکە وەك کابرا بووە بیانی و بە نرخێکی خەیاڵی قۆزتیانەوە... بەڵام بێگانەکە هیچ هەقی ئەم دەلالیەی وەرنەگرت.

## ٤١- بەردەوامی

هەموو ساڵێك هەر لە هەمانكات و شـوێندا كەللەسـەرێك لـەژێر بەفرەكەدا سەرەتاتكێ دەكات.. تا جارێكیتر لەگەڵ هـەوای ناوچـەكە خۆی رادێنێتەوەو دەبێتەوە مرۆڤ.. ئینجا روودەكاتە ئاوەدانی... لـەم شـوێنەدا كـە یەكـەم كەللەسـەری تێـدا شـاردرایەوە لــە مێـژووی مرۆڤایەتیدا.

## ٤٢- خوێن

ئـەوە مـنم.. تـۆی.. ئـەوە... ئـەویترە... ئەمیانـە... برامـە.. باوکمـە.. دایکمـە.. جیرانەکانمـە... خـەڵکی شـارکەمە... خـەڵکی وڵاتەکەمە.. ئێمە هەموومانین سەرکردە و رەعیـەت.. دەسـتمان بـە خوێنی خۆمان سوورە.. مێژوومان هـەر بـە خـوێن نووسـراوەتەوە... خـوێن خـۆری یـەکتری خـۆرین... ئەگـەر هـەر کتێبێکـی مێـژووت خوێنـدەوەو باسـی ئێمـەی تێـدابوو، یـان مێـژووی ئـەم دەڤـەرەت نووسییەوە، تکایە ئەوەی سەرەوە بکە سەرەتای کتێبەکەت.

## ٤٣- چیرۆك

ئەگەر چیرۆکنووسیش نەبیت دەتوانێت ئەم چەند سەرەداوە بکەیت بە چیرۆکێکی ئاسایی.. چونکە کارەساتەکە زۆر لەمە درێژترە کە من بە چەند دێرێك بۆت بنووسم...

بە کورتی: لاشەی کچێکی خڵتانی خوێن، تەمەن چواردە تا پازدە بەهار.. پێوە دیاربوونی جێ پەنجەی چەند دڕندەیەك بە جەستە ناسکەکەی.. شێوەی تاوانەکە وەهای نیشاندەدا کە بە زۆری کچێتی لێ دزراوە چیتریش بە خەیاڵتدا دێت و بیخەیتە سەر ئەم چیرۆکە ئەوا زیادەڕۆیی نییە.. سەرەتاو گرێچن و کۆتاییەکەی لە مێشکی خۆتدا بخەملێنە و ئەوسا وەرە لێکی گرێدەرەوەو بینووسەوە.. لەمە دڵنیابە کە چیرۆکێکی سەرکەوتووی لێ دەردەچێت... ئەگەر شارەزایەکی تەواوی نووسینیش بیت و تاقیکردنەوەت زۆربێت ئەوا دەتوانی بیکەی بە رۆمانیش.

## ٤٤- مەملەکەتی...!

کە دەچیتە مزگەوت پێت سەیر نەبێت ئەگەر وابزانیت خەڵکی ئەم شارە هەموویان لە خواترسن... بەڵام کە نوێژەکەت دەکەی و دێیتە هەیوانی مزگەوت دەبینی پێڵاوەکانت گەیشتوونەتە هەڕاجخانە.. ئەوسا دەبێ قاپقاپەی مزگەوت لە پێکەیت و بچیت ئەم پێڵاوانەت لە دزەکان بکڕییەوەو سوپاسیشیان بکەیت.. رەنگە یاساولێش لەوێ هەبن، بەڵام ئەوان خوا خوایانە دزەکان بە گرتنیان نەدەن، یان نەیانکوژن.

## ٤٥- پەنجەرە

ئەم پەنجەرەیە ناکەمەوە بای ساردی تێدا دێتە ژوورەوە... ئەم پەنجەرەیەی لاکەیتریش ناکەمەوە رەشەبای تێدا وەژوور دەکەوێت.. ئەویدیکەش هەر ناکەمەوە بەردبارانمان دەکەن.. ئەوەی نزیك خۆشمان بە بۆن دەمکوژێت... بەڵام من لەناو ئەم هەموو پەنجەرە داخراوانەدا هەر هەم.

٭

# ٤٦- دیوانی شیعر

شاعیرەکە دوای رێگای لە چاپدانی دیوانە شیعریەکەی چۆنیەتی چاپکردنی بوو بە ئەژدیهایەك و لە گەردەنی دەئالآ... زۆر دەزگای چاپکردنی بەسەر کردەوە... رووی لەم دەوڵەمەند و ئەو لێپرساو کرد، هیچی بۆ نەکرا.. سەرەنجام ئەڵقەی دەستگیرانەکەی و هەندێك وردەواڵەی ماڵەوەی فرۆشت و ئەو کتێبانەی هەشیبوو هەڕاجی کرد... بۆرە دیوان هەر چاپ نەبوو... دانیشتنەکانی خواردنەوەی پارەی بۆرە کتێبیان لە گیرفان داتەکاند.. بۆیە ئەم خەونەشی نەهاتەدی.. لە حەژمەتان چەند دانەیەکی بە کاربۆن نووسییەوە و بەسەر چەند رەخنەگرێك و دەزگایەکی رۆژنامەنووسی دابەشی کرد، بەڵکو ئێ هەر ناوێ بکەوێتە ناو ناوان.

## ٤٧- ئەکتەر

خولیای هونەر کەوتبووە سەری.. بەردەوام بنهەنگڵی پڕ بوو لە کتێب و رۆژنامە و گۆڤار.. هەمیشە لاسایی هونەرمەندە گەورەکانی دەکردەوە.. دوای ئەم هەموو سەرقاڵی و خوێندنەوەو پرۆڤەکردنە، هەر بە کۆمبارسی مایەوە... ئەم کاتە دڵی زۆر خۆش بوو کە دەرهێنەری تیپەکەیانی داوەتکرد و دەورێکی سەرەکی پێبەخشی.. کەچی دوای مانگێك پرۆڤەکردن لەسەر شانۆگەرییەکە پێیانڕاگەیەنرا کە لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی شانۆگەرییەکە نابێ نیشان بدرێت.

## ٤٨- بەڵێندەر

هەرچی پارەی هەیبوو خستیە ناو دەستی بۆ ئەوەی خانووەکەی بۆ بکات.. دوای بناغەلێدان، کاکی بەڵێندەری لێبوو بە هەناری شیرین.. دوای چەند جارێك هاتوچووی دادگا کۆمەڵـە کەسـانێکی ناسـی کـە ئەوانیش بەدەست هـەمان کـەس دەتلانـەوە.. سـەرەنجام لـە قـوژبنی چـایخانەیەکدا بـە کۆمـەڵ دۆزیانـەوە.. ئـەویش بـێ ئـەوەی خـۆی بشێوێنێت سەرو چـایەی بـۆ بـانگکردن، هەریەکەشـی جگەرەیـەکی نایابی دانێ... ئینجا لەسەرەخۆ دەفتەری چەکەکەی دەرهێنـاو سـەرو چەکی بێ باوەڕی پێدان.. هەر ئەوەندەیان دیتەوە تا دوا سۆراخیان لـە نامەکەیەوە زانی کە لە هەندەران بۆ خزمێکی خۆی ناردبوو.

## ٤٩- پەراوێز

ئەمجارەیان زۆر لە جاران بە هەوەستر دیدەنی کرد.. ئەم گۆڤارەشی پێبوو کە بابەتەکەی خۆی تێدا بڵاوکردبووەوە.. بە نازێکەوە لاپەڕەی یەکەمی باسەکەی خستە بەردەم مامۆستا.. جەنابی دکتۆریش هەمووی هەڵدایەوە هەتا گەیشتە پەراوێزەکان، ناوەکانی یەکە بە یەکە خوێندەوە، ئینجا بە گرژییەکەوە گۆڤارەکەی فڕێدایە پێشی و گوتی: ((بابە گیان بابەتەکەت لاوازە، هێشتا ماوتە بۆ نووسین، بڕۆ جارێ بۆ خۆت بخوێنەرەوە...)) کاکی نووسەر بە دڵشکاوی هاتە دەرەوەو بە هاوڕێکەی خۆی گوت: ((پێم سەیرە، مامۆستا هەمیشە لە نووسینەکانم رازییە و هەردەم ئافەرینی لێکردووم، نازانم بۆچی ئەمجارەیان هێنامیەوە سەر سفر..)) ئەویش تێیگەیاند کە لەم نووسینەیدا ناوی مامۆستاکەیتری پێش مامۆستا هێناوە لە پەراوێزا. ئەوانیش یەکتری دەسڕنەوە، بۆیە بەلای ئەمانیشەوە ناوهێنانی ئەویتر پێش ئەو دەبێ سڕینەوەی ئەم کەسە بێت کە هەڵەی وادەکات.

## ٥٠- ناملیکه

دوای مانگێك سەری لە کتێبخانەکاندا بـۆ ئـەوەی نـەختێك لـە پارەی فرۆشتنی ناملیکەکەی بکەوێتەوە دەست و لایەکی قـەرزەکانی پڕ بکاتـەوە.. کەچـی خـاوەنی یەکـەم کتێبخانـە کـە چـووە لای بـە فیزێکەوە پێیڕاگەیاند کە دەبێ کتێبەکانی بباتەوە، چونکە قـوژبنێکی چاکی کتێبخانەکەی داگیرکردووە و دانەیەکیشـی لـێ نەفرۆشـتووە.. ناچار کتێبەکانی لێوەرگرتەوەو زەرف فرۆشەکان لێیانکڕی.

## ٥١- پەیکەر

پەیکەرتاشەکە دوای ماندووبوون و شەونخوونییەکی ئێجگار زۆر قۆناغی یەکەمی پەکەرەکەی تەواو کرد، بەڵام نەیتوانی لەبەر هەژاری قاڵب ڕێژی بکات.. چەند ساڵێك هاتووچۆی ئەملاو ئەولای کرد تا پارەی بۆ ببڕنەوەو گۆڕەپانێکی شاری پێ برازێننەوە... سەرەنجام پەیکەرەکە بۆ منداڵان بوو بە بووکە شووشەیەکی گەورەی پڕ حەزی منداڵان.

## ٥٢- تابلۆ

لە پێشانگاکەدا خەڵکی هەموو یەك یەکە سەرنجی تابلۆکانیان دەدا.. ئەمیش تا داخستنی پیشانگاکە نیگای چاوەکانی لەسەر کەڤالێك نەدەتۆرا.. ئەوەندە بە قووڵییەوە تێیڕادەما تا بوو بە هەوێنی تراژیدیای ژیانی... ویستی تابلۆکە تەواو بکات بۆیە پڕی دایە ئەم چەقۆیەی کە لە پشتی ئافرەتەکە چەقێرنرابوو تا لە جەستەی بێنێتە دەرەوە.. بەڵام لەگەڵ ئاودانی هیستریانەی دەستی، تابلۆکە کەوتە خوارەوە.. ئەوسا گەڕایەوە دۆخی جارانی و هەستی پێکرد کە بێگیانێك بیرو مێشکی تێکداوەو سەفەرێکی پڕ خەیاڵی پێکردووە.

## ٥٣- هەڵسوکەوت

یەك بە یەك بە دەوروپشتی خۆیدا دەهات.. قسەی وەهای بۆ هەڵدەبەستن مەگەر لە فیلمەکانی سینەمادا وێنەی ئاوا هەبن.. لەم بەزمانەدا بۆ خۆی پاڵەوانێك بوو تاکی نەبوو... نۆرە گەیشتە نزیکترین هاوڕێی خۆی.. چیرۆکەکەی ئاوەها بۆ چنی هیچ کامێکیان وەك ئەو ئەستێرەی بەختی نەکوژابێتەوە.. سەرەنجام کابرا جارێکتر نەبووە جێی متمانە.. تەنیا ئەوەندەی قازانج بوو کەس نەدەوێرا شان لە شانی بدات نەوەك بخرێتە ناو لیستە رەشەکەیەوە.. وایلێهات گەلێك لە جاران زیاتر ناوبانگی پەیداکرد.

## ٥٤- نووسەر

کە گوێی لەناوی ئەوبوو تۆزێك سڵەمیەوە، سەد خۆزگەی بەمە دەخواست کە ناوی لەگەڵ ئەو مردووانەدا بهاتبایە کە لەبەر دەرگای هۆڵەکە بێ ئەوەی بزانرێ مردوون ناویان خوێندرایەوە.. خەریك بوو قێز لەمە بکاتەوە کە چۆن لەگەڵ ئەندامێکی تازەی کۆنگرە بچنە ناو یەك هۆڵەوە.. کەچی نووسەری تازە پێش مامۆستا ناوی خوێندرایەوە.. ئەم زاتەش کە خۆی بە ئەندامێکی کۆن دەزانی دوای هەموو ناوەکانی کە تازە وەرگیرابوون بە هۆڵەکە سپێردرا.

## ٥٥- مامۆستا

مامۆستا زۆر سەقاڵ بوو.. هەفتەیەك بوو خەریکی ئامـادەکردنی ئەم کۆڕە بوو... هەمیشە دەیگوت: ئەگەر مامۆستاکەی دیکـە بێتـە ئەم دیدارە ئەوا وەدەری دەنێت و نایەڵێ بێتە ناو هۆڵەکەش.. کەچـی کە هاتە ژوورەوە هەر ئەوەندەی پێکـرا دەفتـەر و پـەڕە کاغـەزەکانی خۆی کۆکردەوەو بەهیچ تکاو پاڕانەوەیەك نەگەڕایەوەو بۆ مامۆسـتای دووەمی بەجێهێشت.

## ٥٦- ڕەش و سپی

بە هەوەسی خۆی باسی دەکردو دەیگوت: ((بەسەری تۆ ئەو برادەرە نەخوێندەوارەو هیچ ناخوێنێتەوە، بەستەزمانەی ناتوانێت بۆ خۆی دێڕێکیش بنووسێت، ئەم کتێب و نووسینانەش هەمووی من بۆی دەنووسم و بەهۆی منەوە ناوبانگی پەیداکردووە..تاد)). هێشتا نیازی وابوو زیاتر باسی بکات کە باسکراو لە سووچێکی چایخانەکەدا سووڕایەوەو گەیشتە بەردەمیان، کەچی ئەمجارەیان قسەکانی بە چەشنێکیتر گۆڕی و ئەوەندەی پیاهەڵدا تا کابرای گوێگر لە خۆی بێزار بوو و پێکەوە بەجێیهێشتن.

## ٥٧- برسییەتی

گرنگ ئەوەیە لەم چیرۆکەدا ئەوەی مەبەستمە بە خوێنەرانی بگەیەنم.. رەنگە کارەساتەکە لای ئەوان زۆر لەمە گەورەتر بێت کە من بەیەك دوو رستە پێیان رابگەیەنم.. چونکە ئەرکی ئەم جۆرە چیرۆکانە ئەمەیە لە کۆتاییدا شتێك لای خوێنەر بەجێبهێڵێت.. با درێژەی نەدەمێ و پێتان بڵێم: ((دوای ئەوەی مریشك فرۆشە گەڕۆکەکە کۆڵانی لاتەکان بەجێدەهێڵێت، دەرگای ماڵێك دەکرێتەوەو ئەم مریشکەی کە کابرا فڕێی دایە ناو تەنەکەی زبڵ، ژنی ئەم ماڵە بە پەلە هەڵیاندەگرێتەوەو بە هەڵەداوان دەگەڕێتەوە ژوورەوەو دەیەوێت بۆ منداڵەکانی خۆی، کە تامی گۆشتیان لەبیر نەمابوو بکات بە دیاری)).

## ٥٨- گۆرانی

دەنگی گۆرانییەکە تێکەڵ بە قەڵەباڵغی و تێکچڕژانی دەنگەکان بوو بوو.. منداڵە سەکنەکەش هات و هاواری پارە کۆکردنەوە بوو.. هەزاران پرسیار و وەڵام تێکەڵ یەکتری دەبوون.. دواجار لە ریزی دواوە دەنگێك بەرزبووەوە..)) تکایە ئەم کاسێتە بکوژێنەوە، ئەم گۆرانیانە بە سکی تێرەوە خۆشن با تام و چێژیان نەڕوات..!)) دەنگەکان هێور بوونەوە.. منیش لەم دەمەدا لە پاسەکە دابەزیم، جا نازانم بیرو لێکدانەوەی خەڵکی ناو پاسەکە چی بوو.

## ٥٩- کۆتایی چیرۆکێك

کـە هـاوین دادەهـات لـەملاو ئـەولا ئـاوی هەڵـدێنجا و چـەند جارێکیش بە پارە دەیکڕی.. بەڵام ئەمساڵ گەڕەکەکەیان وەك گیرفانی خۆی و خێزانەکەی وشکی کرد.. چارەی نەما ناومالّی خـۆی هـەموو فرۆشت.. چەند مانگێك ئاو و خۆراکی بـۆ منداڵـەکانی پـێ کـڕی.. دوای ئەمە لە گەڕەکێکی بە ئاو بوو بە کرێچی.. بەڵام باخەڵیان هـەر هیشك بوو.. چی دەکەن و چۆن دەژین.. تا نووسینی ئەم چیرۆکە بـیرم لە ئەنجامەکەی نەکردۆتەوە.. رەنگە کۆتاییەکەی وەك کابرای جیرانمـان لێ بکـەم کـە پـێش جـەژن خـۆی کوشـت.. تـۆش سەربەسـتی ئـەم کۆتاییەت بە دڵ بێت، یان نا.

## ٦٠- تروسکایی

ئەم دوو دەستەی هەزاران لوغمی لە چیا سەرکەشەکانی کوردستان پێدەرهێنا ئێستا براوەن.. ئەم دوو چاوانەی بە ئاواتیان بوو ئەم خاکە ئاڵتوونەی بێ تەقەمەنی پێ ببینێت ئێستا نابینان.. چاوێکیان تارمایی پێ بەدی دەکرێت.. ئەگەر بگاتە دەرەوەی وڵات رەنگە تروسکاییەکی پێ بەدی بکات... دەیان جار سکاڵای بەرزکردەوە.. سەرەنجام بە خەم ساردی مایەوە، بێ پوول، بێ بژێو، بێ توانا.. ئەوەندەی قازانج بوو لە ئەرشیفی ئێستگەکاندا بە پاڵەوان ناوی تۆمارکرا.

## ٦١- دژەکان

دزو جەردەو پیاوکوژان چی نەما بەم ولآتەی نەکەن.. دارتەل و وزەی کارەبا و مس و فافۆن و چینکۆ و ئاسن و لاستیك و ئۆتۆمبێل و شیش و دار و ماشێنی قیرتاو و تانکەر و بۆری ئاو و سۆندە و چیمەنتۆ و بلۆك و کارگە و شۆفەل و لۆری و قەلابە و داوودەرمان و ئامێری نەخۆشخانە و تاکۆنە شووشە و کاغەز و قونکە جگەرەو نازانم چیتریش..؟! کردیانە پوول و بۆ ئەودیوی سنووریان بەرێکرد..((کێ بەرپرسیارە.. کێ؟..)) وەك شێت و هار رووی پرسیاری لە خەلکەکە دەکرد.. هەندێك گالتەیان پێ دەکرد و بە شێتیان دەزانی، هەندێکیش وەك خەنجەر دەخزایە گیانیان.. بەلآم لە ئاخ هەلکێشان بەملاوە هیچیتریان پێنەدەکرا و بێ دەنگ دەبوون... گەیشتە نوێنەرێکی نەتەوە یەکگرتووەکان بە شرە ئینگلیزییەکەی هەمان پرسیاری لێکرد، ئەویش دلنیای کردەوە کە زۆربەی کەسانی نەتەوەکەی دژی تەکنۆلۆژیان.. خۆخۆرن.. هەلپەرستن.. دوژمنی نەوەی خۆیانن.. پشوویەکی درێژی هەلکێشاو ئەوەندەی پێکرا کە بلێت: ((باش نییە خاك و خۆلی ولآتەکەمیشیان نەفرۆشت؟! مەرج بێت کە پەرلەمانم دامەزراند تۆلەی هەموو ئەم دەستدرێژیانەتان لێ بکەمەوە..)).

## ٦٢- سەرنج

کەللەسەرێك لەسەر مێزێك دانرابوو... چەند خەنجەرێکی ژەهراوی تێدا چەقێنرابوو.. سەدان دەست تاویان دابـووە خەنجـەرەکان و پێیـان دەرنەدەهات.

تێبینی: دەشێ ئەم چیرۆکە بکرێت بە تابلۆ.

## ٦٣- دیل

کە دەسگیریان کرد... وایزانی بە هانایەوە دێت.. ویستی باوەشی برایەتی بۆ بکاتەوە... کەچی ئەو بە قەمە وەرگەڕا سەری و رقی حیزبایەتی بۆ هەتا هەتایە لێکی دابڕین.

## ٦٤- دیمەن

دیلە بێگانەکان بە خۆشەویستییەوە لە هۆڵەکە نانیـان دەخـوارد و جگەرەیان دەکێشا.. لە دەرەوەی ئەویش برایەکان بە قەمـە جـەرگیان هەڵدەدڕاو چاویان هەڵدەکۆڵدرا.

## ٦٥- ڕێگا

لەکاتی شووشتنەوەی تەرمەکەیدا تاقە دینارێکی ئاسنی لە گیرفاندا دۆزرایەوە.. ئەوسا قوتابییەکەی زانی بۆچی مامۆستا بەپێ ڕێگای کۆلێژی دەبڕی و جارێک لە جاران لەگەڵیدا سواری پاس نەبووە.

## ٦٦- پێڵاو

لە هەڕاجخانەکەدا جووتە پێڵاوەکانی خۆی هەڕاج کرد.. هات لە دووکانەکەی (سابیر خۆشناو) جووتە پێڵاوێکی لاستیکی هەرزانی کڕی و باقیەکەشی خواردنی ژەمێکی جەژنی پێ کڕی.

## ٦٧- دەرۆزەکەر

بە کتێبی (ئەلف و بێ) یەکەی ئیبراهیم ئەمین باڵدار، زانی کە مامۆستایە.. دینارەکەی دایە دەستی و سەدەمین دەرۆزەکەری ئەو رۆژەی بەرێخست.

## ٦٨- دۆلار

ئەم نیوە گەڵایەی لە دەرەوە بۆیان ناردبوو، بردیە بۆرسەکەی شێخەڵڵا.. لەوێدا دۆلارفرۆشەکان لێی خڕبوونەوە:

- ئەمە دۆلاری مۆدیل کۆنە و وەك هی ئێستا پارە ناکات.
- دەبێ تەزویر نەبێت.
- پەنجا دۆلاری هیچ ئەمەی بۆ چییە.

بەهەرحاڵ بە نرخێکی هەرزانتر لە بەهای خۆی لەبەردەستیان دەرهێنا، بەڵام دڵی بەهەندێ خۆش بوو کە خۆراکی ئەم رۆژەی منداڵەکانی پێ مسۆگەر کرد.

## ٦٩- وێران

ڕەشەبایەك هەڵی کرد و لەم مەملەکەتە هەڵیتەکاندم.. خۆم لە وێرانەیەکدا دۆزیەوە، خەڵکەکەی هەموو شارە مێروولە بوون و نەوتیان پێداکرابوو.. چەندی گەڕام و سووڕام و هەوڵمدا کەسێکم نەدۆزیەوە هەتا بزانم ئەم شارە بۆچی خاپوور کراوە.

بە جەستەیەکی شل و شەکەتەوە، بە مێشکێکی ژەنگاوییەوە سەرخەوێکم شکاند.. بەیانی کە هەڵسام ئەم دیمەنانەم بە چاوی خۆم دیت: کوندەبەبۆ لە جێگای کەڵەشێر بانگی دەداو خەڵکەکە لە خەو رادەبوون.. راکێشان راکێشانی نان بوو لەم مەملەکەتە.. لەسەر کورسی سەرکردەکان خەڵکەکە بە خوێنی یەکتری تێنووبوون و یەکتریان قڕکرد و جیارێکیتریش نەوت بەسەر شاری مێروولاندا دەکرایەوە.

# ٧٠- دوا ژمارە

سەرم بە هەر کوچە و کۆڵان و چایخانە و تراشخانە و چێشتخانە و بازاڕ و.....تاد، دادەگرت هەر باس و مقۆمقۆی هەندەران بوو... مامەڵەی پاسەپۆرت و ڤیزام کرد بۆم بە کڕین نەدەهات.. کەسێکیش نەبوو باڵم بگرێت و رزگارم بکات.. تاقە برادەرێکم شك دەبرد بە زوویی ئەمەم بۆ نووسی: ((فریادڕەسەکەم وەرە لەم دۆزەخە رزگارم بکە، یا لە بەهەشتی ئەوێدا بحەسێمەوە.. چیم بۆ دەکەی و چۆن رامدەکێشی گرنگ نییە.. تاکە هیوام ئەمەیە بگەمە هەندەران.. تکایە پەلەم بۆ بکەیت، با من دوا کەس نەبم و دوا ژمارەش نەبم لەم دۆزەخە...)).

تێبینی یەکەم: ئەی تۆش!؟...ئا..ئا.. تۆی خوێنەر!؟.

تێبینی دووەم: من وەك چیرۆکنووس تا سەر ئێسقان بە خاکەکەی خۆمەوە نووساوم و ئێرەی دۆزەخم لەلا بەهەشتە.

## ٧١- دوژمنداری

لەبن دیواری بـاغی شـار لای یـەکێك لـە پینـەدۆزەکان وەسـتا.. جگەرەیەکی دەرهێنا، هێشتا داینەگیرساندبوو کردیـان بـە قوربـانی گوللەیەکی دوژمنداری.. خۆی و جگەرەکەی دەمی و پێڵاوەکان بـوون بە تابلۆیەکی سەر شۆستەکە.

## ٧٢- ئێرەو ئەوێ

قاچەکانم لێرەن.. سەریشم لە هەندەران.. نە لێرە دەبمەوە، نە لەوێش دەحەسێمەوە... لە هیچ شوێنێ لەنگەر ناگرم.. نازانم کەی لەم خاکەدا دەڕوێمەوە.. خۆزگە باڵندەیەك دەبووم بێ مەملەکەت.

## ٧٣- چەقۆ

نووسەر و هونەرمەندەکانیان تێکڕا لە هۆڵێکدا کۆکردەوە تا بە ڕۆشنبیری خۆیان مشورێك بۆ میللەتە کلۆڵەکەیان بخۆن.. کەچی تا کۆنگرە تەواو بوو زمانیان هەموو بوو بە چەقۆ و بە خوێنی یەکتر کفت بوون.

## ٧٤- بینین

سەرم لەم میللەتە سووڕماوە وەك شارە مێروولە بــەرەو هەنــدەران ڕێچکەیان بەستووە.. کەچی شێخەڵڵاکەی مــن جێگــای دەرزی تێــدا نابێتەوە.. خودایە هەر بە زیادیکەی، بــەڵکو شــوێنی کەمبوونــەکان بگرێتەوە.

## ٧٥- سەفەر

کتێبەکانی خۆی هەموو هەرزان فرۆش کرد.. ناو ماڵەکەی هەموو هەراج کرد.. ئەوەی هەیبوو کردی بە دۆلار و بەدوای قاچاغچییەکدا دەگەڕا تا بە گەرەنتی بێ ڤیزە و پاسەپۆرت بیگەیەنێتە کۆشکی ئارەزوو.. منداڵەکانیشی لێرە لە خوانەی ماڵی باوان چاوەڕێی گەڕانەوەی بن.. تا ئەوانیش لەم فێردەوسە بێ بەش نەبن. ڕۆیشت و لێرە ئازادبوو، بەڵام لەوێ بەندبوو.

## ٦٧- خۆزیا

ئەوەتانێ دوور بە دوور چاوەکانم هەتەر دەکەن.. جاران گوندی ئێمە بوو، باب و باپیرانمان لەوێ گەورەبوون.. ئێستا خەڵکانێکی غەوارەی لێیە.. ناشوێرم لەمە زیاتر بڕۆم و بچمە ئاوایی و سەردانێکی گۆڕی باوکم بکەم.. وەلێ لێرەوە چاوەکانم دەکەم بە دووربین و تێر بە خەیاڵ تێیدەڕوانم.. لێرەدا بۆنی ئەم خاکە دەکەم.. لێرەوە بەم خەیاڵە خۆشە دەست لە کێلەکانی گۆڕستان و بەتایبەتیش هی باوکی رەحمەتیم وەردێنم.. تێر لە ئاسمان رادەمێنێم، بەڵکو ئێ ئەمە خوایە و دەمکات بە کۆترێکی گوندەکەی خۆم و تێر تێر بەسەر ئاواییدا دەسووڕێمەوەو تێنوویەتیم بە ئاوی بیرەکەی کۆنە هەوارم دەشکێت.

## ٧٧- کێشمەکێش

ئەوە خۆمم بەدای سەرابی خۆم کـەوتووم و سـێبەرەکەم هەمیشـە وەك مۆتەکە بە دوامەوەیە، هەندێکجاران مـن پـێش ئـەو دەکـەوم و راوم دەنێـت گـەلێکجاریش ئـەو لـەپێش منـەو مـن شـوێن پێـی هەڵدەگرم.. گرنگ ئەوەیە هەردووکمان بە دوای دەرفەتێکدا دەگـەڕێین تا یەکتری غافڵکوژ بکەین.. خوایە هەردووکمان لێك نزیك نەکەیتەوە چونکە لە هەردوو حاڵەتدا هەر خۆم دەسڕێمەوە.

## ٧٨- بزربوون

تازە خەریك بوو خۆم دەدۆزییەوە... تازە وەڵامی پرسیارەکانی خۆم پێدەدرایەوە.. تازە هەنگاوەکانم گورج دەبوون.. بەڵام کە گەیشتمە ناو حەشامەتەکەی شێخەڵڵا، زوو هەڵیان لووشیم و رفاندمیان.. ئێستا خۆشم لە چارەنووسی خۆم ناگەم و خۆشم نازانم چۆن دزراوم و لە کوێندەرم.

## ٧٩- پرسیار

دوای گفتوگۆیەکی دووروودرێژ پێمگوت: ((دەبێ ئەو خەڵکەی ئێمە لە دوورگەی (گوام)دا ولاٌتێك دروست نەکەن!؟)).. ئەمیش وەلاٌمی دامەوە گوتی: ((ئەی بۆ لە ئەڵمانیا نەبێت؟)). برادەرێکیتر لەملاوە ئاگای لە گفتوگۆکە بوو بەجۆرە کۆتایی بە دەمەتەقێیەکەمان هێنا: ((بەخوا لەوێش هەموو پێکەوە لە مەملەکەتێکدا کۆبکرێینەوە براکوژییەکە بۆ ئەوێ دەگوازینەوە)).

## ٨٠- پێچەوانە

وادیارە قەت ناگەین بەیەکتر من بە نووکی قەڵەمەکـەم و ئـەویش بە خەنجەر و شمشێر.. من بە پەیڤین و هـزر و ڕێزلێنـان و ئـەویش بـە جنێو و هەڕەشە و قسەی بە توێکڵ.. وامان لە چارەدا نووسراوە هـەر دەبێت بەمجۆرەش برای یەك دایك و باوك بین.

## ٨١- گەمەی نوێخوازی

ماوەیەك بوو مشتومڕیان لە رۆژنامە و گۆڤارەكان نەدەبڕایەوە.. خەڵكەكەش لێیان تێكچووبوو نەیاندەزانی بە كامەیان بڕوا بكەن و بزانن كامەیان مامۆستای ئەویتریانن.. كارگەیشتە ئەوەی كە شەڕی ساردیان لێبوو بەڕاستی و چەند رەخنەگرێكیش هاتن و خۆیان خزاندە ناو شەڕەكەوە.. چایخانەكەی (مەچكۆ) بوو بە دوو گرووپ هەندێكیان (.....) یان خستبووە سەرشانی خۆیان و هوتافی رابەرایەتیان بۆ لێدەدا.. لەلاكەیتریشەوە (.....)یان لەسەر شانی خۆیان دانابوو و بە هەمان شێوە رابەرایەتیان پێدەبەخشی.. هەردوو گرووپ بە توونـدی بەرانبەر یەكتر وەستان... هەراو زنایەكە تا دەهات زیاتر پەرەیدەسەند و بە كەس دانەمركایەوە.. ئەوكات (.....) لەملاوە بە تووڕەییەوە هات و دڕی بە خەڵكەكەدا و ئەویش چوو لەسەر تەختێك وەستاو پێیووتن: (ئەدی بۆچی كەسێكیش ناوی ئێمە ناهێنێ، خۆ من باوكی هەر هەموویانم، من بەردی بناغەی نوێخوازیم، ئەم نوێخوازییەی خوێنی لەسەر رژاوەو جوێنرێژی و ئەزیەتمان لەسەریا چەشتووە... بەخوا ناهێڵم هەروا بە ئاسانی بۆیان بچێتەسەر.. ئێستا كاتی ئەوە هاتووە منیش قسەی خۆم بكەم، ئێوە هیچتان رابەر نین، من لەناو

هەناوی روانگەوە بزووتنەوەی مودەرەنیزمم خولّقاندووە، فەرموون ئەوە دەق شاهێدە، فەرموون بەرهەمە رێچکەشکێنەکانی من تەماشاکەن..).

دیاربوو زۆر درێژەی بە قسەکانیدا، بەڵام ئێمە هەمووی ناگێڕینەوە با سەری خوێنەریش نەیەشێنین.. ئەوەندە هەیە دوای ئەم قسانە یەکسەر قەڵەمەکەی (رۆلان بارت)ی لە گیرفانی خۆی دەرهێناو کۆتایی بە کێشمە کێشەکە هێنا.

## ٨٢- ناوبراوی ناونەبراو

لەبەردەم کتێبخانەکە وەستابوون و سەیری گۆڤار و رۆژنامەکانیان دەکرد.. ئەوەی هاتە لایان لە رۆژنامەفرۆشەکەی پرسی: (ئەرێ کاکە سیروان چی نوێ هاتووە...؟) پێش ئەوەی سیروان وەڵام بداتەوە (.....) گۆڤارێکی نوێباوی لە دەست بوو دەیخوێندەوە، پیشانیداو وتی: (ئەم گۆڤارە تازە هاتووەو یەکەمجاریشە بڵاودەکرێتەوە..). ئەویش یەکسەر وەڵامی دایەوە: (دەبێ ئەمەشیان نووسینی ئەو برادەرەی تیا نەبێ کە کارگەی نووسینی هەیە...!؟) پێش ئەوە (ن) وەڵام بداتەوە، (.....) یەکسەر لێیوەرگرتەوەو وتی: (مەبەستتان ئەو برادەرە نییە کە دەمەتەقێیەکیشی لەگەڵ خۆی کردبوو بەناوێکیتر بڵاوی کردبووەوە!!؟).. (ن) قسەکەی وەرگرتەوەو وتی: (دەنا لەم گۆڤارە نوێیەشدا ئەو برادەرەی تیایە، تێناگەم چۆنی زانی ئەم گۆڤارە دەردەچێ و خۆی گەیاندووەتێ!!.. بێ شک چەلاوەکەی باشە!؟.. گرنگ جۆری نووسینەکە نییە پیاو ماکینەی نووسینی وای هەبێ پەکی ناکەوێ!!؟..). هەرسێکیان بێ ئەوەی ناوی بهێنن لە یەکتر حاڵی بوون، بەڵام (سیروان) کە سەیری بابەتی نووسین و ناوەکانی کرد لە راست وێنەی ناوی ئەو زاتە سەنگرایەوەو بە پێکەنینەوە وەك

ئـەوەی ئـەویش گرەوەکـەی هـەلێنابێ گۆڤارەکـەی بـەکراوەیی لـە نووسـینەکەی ئـەو خسـتە سـەر گۆڤـار و رۆژنامـەکان.. بـە سەرسوورِمانەوە پێیووتن: (مادام ئەوەندە دەنووسـێ و پاداشـتی زۆرە دەبێ کەی قەرزەکانی من بداتەوە).

## ٨٣- منی نادکتۆر

خولەکێك زیاتر بوو بۆم دەرست، ئەویش هەر سەری دەلەقاند.. گەیشتمە سەر باسی نوێخوازی دونیا و باسی بونیادگەرییەکانی لای خۆمان، ئەو هەر سەری خۆی دەلەقاند جارجارە نەبێ بۆ تام و بۆ بابەتەکانی ناو نامەی دکتۆراکەی تێکەڵ گفتوگۆکە دەکرد.. گەیشتینە بیردۆزە نوێباوەکانی دونیا بوو بە باسی (هنتینگتن) و (فۆکۆیاما).. ئەو برادەرە نامەی دکتۆراکەی لەوێ بە کەڵکی نەهات بۆیە پێیوتم: (ئەرێ ئەم عەولەمەیە چییە لە ماوەیەدا گفتوگۆی زۆری لەسەر دەکرێ.. دەڵێن دونیا وەك گوندێکی بچووکی لێدێت!؟..). لەم دەمەدا برادەرێکیتر بەسەر پرسیارەکە داهات و خۆی پێڕانەگیراو پێیوت: (دکتۆر گیان تۆ بۆخۆت خەریکی ئەدەبیاتی کلاسیکی خۆت بە چیت داوە لە عەولەمە با ئەم بابەتانە بۆ پسپۆڕانی خۆی لێگەڕێین.). منیش بۆ ئەوەی دڵی نەرەنجێ وتم: (گرنگ ئەوەیە لە پسپۆڕی بابەتەکانی خۆتدا شارەزابی..)، بەڵام من لە برادەرێکی دکتۆری دەروونزانیم داواکرد چەند سەرچاوەیەکم لەبارەی (لاکان) بۆ بهێنێ، کەچی ئەو زۆری پێ سەیر بوو بەسەرسوورمانەوە وەڵامی دامەوەو وتی: (من ئەم (لاکان)ە ناناسم و نەمبیستووە حەز دەکەم

ئەگەر تۆ سەرچاوەی وات هەیە پێمبناسێنی پێش ئەوەی قوتابییەکانم ئەم پرسیارەم لیّ بکەن). دکتۆر بە پێکەنینەوە وەك ئەوەی بەسەرخۆی نەهێنێ وتی: (گرنگ ئەوەیە من پیتی دال لەپێش ناوەکەمدا هەیە، بەڵام حەیف ئێرە جێگای من نییە چاکتر وایە منیش بۆ (لیبیا) هەیەی لیّ بکەم، دەزانم لەویّ زۆر خزمەتم دەکەن و گیرفانەکانم پڕ دەکەن لە گەڵا.). ئەوجا برادەرەکە بە پێکەنینەوە وتی: (ئێستا تۆ لە عەولەمە گەیشتی.).

## ٨٤- پرسیار

ڕەشەبایەکی بەهێز هەڵیکرد، خۆم لە هیچ شوێنێك پێنەگیرایەوە، لە دەشتاییەکی کاکی بە کاکی چەقیم، جووڵەم پێنەما، ڕەشەباکەش زیاتر بە خاکەوەی دەنووساندم.. سەیرم کرد دوو دەست لەملاو ئەولاکەی ترمەوە ڕایاندەکێشام.. ئەوەندەیان ڕاکێشام، هێناو بردمیان و هەژاندمیان تا وردە وردە لەناو خاکەکە چەقیم.. تەنیا سەرم بە دەرەوە مابوو! ئێستاشی لەگەڵ دابێ نازانم دەمردم، یان ڕزگارم دەبێ، هەر تەنیا بەرگەی ڕەشەبایەکیتر دەگرم، یان ئەوەتا لە برسان دەمرم یانیش ئەم تەوژمە سەرم هەڵدەقەنێ و جەستەشم لەژێر خاکا دەڕزێ، ئیتر نازانم چارەنووسم بەچی دەگات!؟ کەی و چۆن و کێ بەهانامەوە دێ!؟ چ دەستێك لەوێرانە خاکەکەی (ئێلیەت) دەرمدێنێ. پرسیار. پرسیار بەردەوام پرسیار لە بوون و مانی خۆم دەکەم.

## ٨٥- ڕەخنە

چوومە چایخانەکەی مەچکۆ بۆ ئەوەی پشوویەك بدەم و تۆزێك لەگەڵ برادەرە نووسەرەکانم دانیشم.. کە گەیشتمە ئەوی بینیم دوو شاعیر و هەرتك ڕەخنەگرەکانیان دەستیان ناوەتە بینە قاقای یەکتر و کورسی و مێزەکان هەمووی تێکچووبوون، ویستم لێکیان بکەمەوەو هێوریان بکەمەوە، هەر ئەوەندەمزانی مستێکم تێ سرەوێنرا، دەپەڕیم و بە کتێبخانەکە کەوتم و هەرچی کتێب و چی نووسراوی تێدابوو بەسەریەکدا رمان، ئەودەم دەبە نەوتێکی لێبوو، جگەرەی برا دۆستە حەشاشەکانیش کەوتە سەر کاغەزەکان و هەمووی داگیرسا.. تا ئاویان هێنا و کوژاندیانەوە، هیچ نەما تەنیا پێنج شەش پارچە کاغەزی بچووك نەبێ کە بەبێ نازی لەسەر زەویەکە چاوەڕوانی دەستی منیان دەکرد.. کە کۆمکردنەوەو لە تەنیشت یەکترم دانان و سەیرم کرد پیتەکانم بەم شێوەیە خوێندنەوە: (ر) هێنام دامنا پاشان (ە) و ئینجا (خ) دوای ئەمە (ن) و پاشان (ە).. ئەمەم لەسەر زەوی زۆرانبازییەکە کرد بە تابلۆیەك و ڕۆژنامەنووسەکەش هات بۆ ڕۆژنامەکەی خۆیان کردی بە ڕاپۆرت.

* تێبینـــی: دەکـــرێ لـــەجیاتی ئـــەم ڕۆژنامەنووســـە نـــاوی هـــەر ڕۆژنامەنووســـێك بنووســـێ کـــە تـــۆ بـــە دڵتـــە.. ئەگـــەر خۆشـــت ڕۆژنامەنووسی ئەوا دەکرێ ناوی خۆت بێ.

## ٨٦- مەیخانە

تا دانی نیوەڕۆ بۆ مووچەیەك كاری دەكرد.. دوای ئەمەش بۆ مووچەیەكیتر.. ئێوارانیش بوو بوو بە میوانی هەمیشەیی یانەی ڕاگەیاندن.. شەوان دوای ئەوەی دەبوو بە گاڵتەجاڕی مەردوومەكانی ئەوێ بە چوار دەستە لاشەكەی هەڵدەگرنەوەو فڕێی دەدەنەوە پێش ماڵەكەی خۆی... خێزانەكەی لێی بێزار بووبوو، هەندێك شەوان دەرگاشی لێنەدەكردەوەو تا بەیانی لەبەر دەرگای ماڵەوە هەڵدەكوڕما... بەیانیان هێشتا هەر مەست بوو كە بەرەو دایەرە شۆڕی دەكردەوەو لەوێ لەفەیەكی سەفەری دەكردە قاوەڵتی.. ئێواران كە باوكەكان دێنەوە منداڵەكانی گەڕەك هەموو بە هەڵەكە سەماوە بە بە پیریانەوە دەچن، كەچی كوڕ و كچەكەی ئەو وەك هەتیو بە هەنیسكی گریانەوە بەرەو باوەشی دایكیان دەبنەوە.. ڕۆژێكیان (بێكەس) لە دایكی خۆی پرسی: ((دایە گیان ئەوە بۆچی باوكی ئێمەش وەك هی منداڵەكانی گەڕەك نایەتەوە ماڵ)). دایكیشی ویستی دڵی بداتەوە بۆیە وەڵامی دایەوەو گوتی: ((ڕۆڵە گیان ئیشی هەیە كە ئەو دێتەوە ئێوە خەوتوون.)) ئەمجارە (خەندە) لە دایكی پرسی: ((دایە گیان باوكی ئێمە چۆنە تووڕەیە، یان دڵخۆشە. قەڵەوە

یانیش لاوازە.....تاد)) دایکیشیان چیتر بەرگەی ئەم پرسیارانەی نەگرت بۆیە بە چاوی پڕ لە گریانەوە وێنەی لە رۆژنامە و گۆڤارەکان نیشاندان.. بەڵام سەری لەوە سوورمابوو نەیدەزانی لە چ کات و شوێنێك ئەم نووسینانە ئەنجام دەدات.

## ٨٧- شێتی هۆشمەند

خۆی و کتێبەکانی بن هەنگڵی هەمیشە لەگەڵ شەقامەکانی شاردا سەرەتاتکێیان دەکرد.. ڕۆژێکیان دەستەکانی خۆی لەسەر چاوەکانی کردبووە سێبەر و وەك دووربینی پێبێت ئاوەها سەیری خۆری ئاسمانی دەکرد. لەگەڵ خۆی دەدوا.. پرسیاری ئەم گەردوونەی دەکرد.. جارجارەش لەبەر خۆیەوە پرتە و بۆڵەی دەکرد و گەشکەی بەرزدەکردەوە.. هەندێکجاریش دەگریاو هاواری دەکرد و خەڵکەکەی دەدواند و لێپێچانەوەی لەگەڵ دەکردن و ڕاست و چەوتی فێر دەکردن.. هەندێکجاریش عەقڵی نەیدەگرت و جوێنی بەخۆی و هەموو خەڵکەکە دەدا.. هەندێکجاریش دەچووە سەر شوێنێکی بڵند و دەبووە پاشای مەملەکەت و خاوەن و بنیادنەری ئەم میللەتە... ئەم ئێوارەیە کە گەیشتینە بەردەم (مەچکۆ) چاوەکانی خوێنیان لێ هەڵدەڕژا، شەقی هاری لە کورسی و مێزەکانیش هەڵدەدا و جوێنی بە نووسەرە قەڵەم فرۆشەکان دەدا... لەناکاو برادەرێك بانگی کرد ((ڕۆڕۆ.. ڕۆڕۆ..))، بەڵام ئەو وەك گوێی گران بێ هیچ وەڵامی نەدایەوە، ئەمجارە شیعرە بڵاوکراوەکەی بە لاپەڕەی کراوەیی ڕۆژنامەکە نیشاندا، وەك ئاگرێك ئاوی بڕژێنێتە سەر یەکسەر سارد بووەوەو چوار

مەشـقی لەســەر تەختــەی چـایخانەکە دانیشــت و دەســتی کـرد بــە خوێندنــەوەی بابەتەکــەی و برادەرەکەشــی بــە چـایەك داوەت کـرد و داواشی لێکرد بۆ پێویستی بـایی بەخشیشـەکەی ئـەم بابەتـە پـارەی بەقەرز بداتێ تا وەریدەگرێ.

## ٨٨- جۆکەر

مانگێك زیاتر بوو بەردەوام سەیری گۆڤار و رۆژنامەکانی دەکـرد، وێنەو نووسینەکانی ئەو زاتە لە چاوەکانی دەچەقین بۆیە بە فیزێکـەوە دایدەنانەوە جێگای خۆیان.. خۆشی نەیدەزانی بۆچی ئەم پالەوانە لێی بووە بە مۆتەکە و سواری ملی بووە... پێـی سـەیر بـوو ئـەوێك کـە نەتوانێ تەنانەت ناوی سەرجەم گۆڤار و رۆژنامەکان بـژمێرێ و بزانـێ ئەو زاتە چۆن دەتوانێ باراش بۆ هەمووان لێبکـا و بەسـەر هیچـیاندا بازنەدات، تەنانەت لـە ژمارەیـەکی نـوێی هـەر یەکێکیانـدا ئەگـەر بابەتی نەبووایە لە بژێوی ماڵ و منداڵەکانی دەبڕی هەر رۆژێکیان بۆ هەوەس دەستی دایە گۆڤارێکی دەرەوەی هەرێم بەم نیازەی کـە ئـەوی تێدا نەبێ، کەچی کە لاپەڕەکانی هەڵدایەوە لەوێش مانـدوو نـەبوونی لەگەڵ کرد.. بێزار بوو... رقی لـە هـەموو گۆڤـار و رۆژنامـەکانیش بووەوە.. بە خەمبارییەوە لە چایخانە دانیشت... برادەرەکەی کە زانـی چی لە دڵ دایە و بە کزی بینی لێـی هاتـە پـێش و ئـەمیش بـەمجۆرە رازەکانی لەمەڕ کابرای نووسەر هەڵڕشت (ئـەو مامۆسـتا نووسـەرە!! ئەو زاتە لەخۆ رازییە کە هەمیشە بە شان و باڵی خۆیدا هەڵدەداتێ و هەڵوێستی شۆڕشگێڕی و پاکی و نیشتمانی بەوانیتر دەفرۆشێ، لەگەڵ

نووسین و کردەوەکانی زۆر هاوتەریبن) من دەزانم هەموو سەرە مانگێك دەچێتە پایتەخت و پارە قەڵپەکانی هەموو گرد دەکاتەوەو لە بازاڕی شێخەڵڵا دەیانگۆڕێتەوە..)) ئەمیش وتی: ((وەڵڵا راست دەکەی مامۆستا ئێمە تەنیا ئاگامان لەم نووسینانەی هەیە کە بەناوی خۆی دەیاننووسێ ئەدی ئەوانەی بەناوی دەمامکدارەوە دەیاننووسێ. چ بزانین دژی بیروباوەڕ و میللەتەکەی خۆشی نانووسێ.)) ئەوان لەم قسانەدا بوون نووسەری گۆڕین دیارکەت، بۆیە بە جووتە چایخانەکەیان بۆ بەجێهێشت.

## ٨٩- شانۆگەریەکی ئەزموونگەری

ویستی کۆتایی بە دەوری خۆی بهێنێ و زوو لەسەر شانۆ بێتە خوارەوە، چارەی نەبوو بەم دەمە نایەتەوە بیری ناچار بە خەڵکەکەی گوت: ((بینەرانی بەڕێز بەم جۆرە کۆتایی بە شانۆگەرییەکەمان دێنین.)) دەرهێنەر گەلێکی لا ناخۆش بوو، بەڵام زوو خۆی گەیاندە سەر شانۆ بە پەلە قسەکانی لێوەرگرتەوەو وتی: ((بەڕێزان ئەمە کۆتایی شانۆگەرییەکە نییە، لەو ئەکتەرەم زوێر مەبن، ئەوا بە ناچاری لە شوێن ئەو ئەکتەرەی خاوەن ئەم دەورە دانراوە، کە لە سەرەتای شانۆگەرییەکە لە پرۆڤەکردندا بەشدار بووە))، بەڵام پێش نیشاندانی بێ ئاگاداری ئێمە هەگبەی خۆی بۆ هەندەران پێچایەوە.. کاتەکەمان دەستنیشان نەکردبایە دوامان دەخست، بۆیە لەجیاتی ئەو برادەرە داوای لێبووردنتان لێدەکەم و ئێستا خۆم شوێنی دەگرمەوەو هەروەك شێوەی دەرهێنانی شانۆگەری شێوەیەکی ئەزموونگەری نوێ بێت..)) دەرهێنەرەکە هەراو زنایەکی وای خستە سەر شانۆ و توانی هەموو کەلێنەکانی شانۆکە پڕ بکاتەوە، خەڵکەکەش زیاتر لەگەڵیدا ئاشنای شانۆگەرییەکە بوون و رەخنەگرەکانیش بە شێوەیەکی نوێیان لە قەڵەمدا.

## ٩٠- کارگەی شیعر

بـەردەوام نووسـینی بـۆ رۆژنامەکـە دەنـارد، کەچـی هەمیشـە بەرهەمـەکانی لـەناو تەنەکـەی بـن مێـزی لێپرسـراوی لاپەڕەکـە دەدۆزرانەوە.. خەریك بوو واز لە شیعر نووسـین بهێنێـت، بـەڵام ئـەو برادەرەی پێش ئەو نهێنییەکەی زانیبوو بـۆ ئەویشـی درکانـد.. زۆری پێنەچوو خۆی بە خاوەن داوەتی یانەی راگەیاندن دۆزییـەوە... لەگـەڵ ئەو شاعیرەی لێپرسراوی لاپەڕەی ئەدەب بوو واپێکهاتن، کە ببـێ بـە کڕیاری هەمیشەیی لاپەڕەکە و هەر دە دێڕ شیعر بەرانبـەر چـارەکێك عەرەقی قاچاغ بێت.. وایلێهـات موشـتەریتر زۆر پەیـدابوون ئـەوەی شیعریشی نەزانیبایە بە نرخی زیاتر بۆی دەنووسراو لـەم رۆژنامەیـەدا مـۆری شـاعیرێتی و ناوبـانگی بـۆ جـاڕ دەدرا.. بـوو بـە کارگـەی دروستکردن و بە باڵا بڕینی شیعر.

## ٩١- نهێنی

دانیشتووانی چایخانە پێیان سەیر بوو، نەیاندەزانی نهێنی ئەو ڕەخنەگرە لەچی بوو، کە پێشتر هەموو دەم بە ڕقەوە باسی نەزانینی دەکرد.. کەچی ماوەیەکە گۆڕانێك لە ئارادایە، ڕەخنەگری تاین بەجۆرێکیتر بە شان و باڵیدا هەڵدەدا و شیعرەکانی لەگەڵ شیعری جیهانی بەراورد دەکات.. سەیرە دوێنی چۆن وەسفی دەکرد و ئەمڕۆش چی لێ دەکات. خەڵکینە منیش وەك ئێوە پرسیاری ئەم نهێنییە دەکەم و لە لوغزەکەی نەگەییووم بەڵێنتان پێدەدەم هەر کاتێك ئەم نهێنییەم زانی لە کورتیلە چیرۆکێکیتردا بۆتان بدرکێنم، چونکە من هەمیشە لەگەڵ ئێوەدا دۆستایەتیم بەردەوام پێدەدەم.. من قەرزاری ئێوەم بەم نهێنییە.. نهێنی ڕەخنەگرێکی ئەم سەردەمە.

## ٩٢- حەربا

هێشتا بەرێنەکەوتبوو بۆ هەندەران.. ئەم شەوە لەگەڵیدا دانیشتم و داوەتەکەمی قبووڵ کرد.. من زیاتر مەبەستم ئەوە بوو لە نهێنی ئەو بایەخپێدانەی ئەو بگەم، لە شوێنێکی گفتوگۆماندا ویستی قەناعەت بەمن بێنێ، کە گرنگ لای ئەو گەیشتن بە هەندەرانە بۆیە ناوەندی دارەکەی گرتووەو لە هەردوولاش دەخواو هانی منیش دەدا، وەك ئەوبم، بۆیە جانتاکەی کردەوەو گەڵاکانی هەردوولای نیشاندام، ئینجا ڕێگای سواڵکردن و چۆنیەتی خۆ گەیاندنی بە پیاوە گەورەکان فێردەکردم و چۆن لای (أ) خۆشەویست دەبم و لای (ب)ش بە هەمان شێوەو لە ڕاگەیاندنیش بە هەمان شێوە جێگای بایەخپێدانی هەموو لایەك بم.. بەردەوام ئەم ڕێگا دبلۆماسیانەی بۆ ڕاڤە دەکردم.. بەڵام من چیتر خۆم بۆ ڕانەگیرا نەمزانی نە لەبەر ئەوەبوو، کە سەرخۆش بوو بووم نە لەبەر ئەوەش بوو، کە بیرکردنەوەم لەگەڵ ئەو برادەرە یەکی نەدەگرتەوە، بۆیە وەك ئەوەی لەناو جەماوەر شیعر بخوێنمەوە، یان گوتاریان ناڕاستە بکەم ڕووم لە دانیشتووانی یانەکە کرد و گوتم: ((بەڕێزان تا تەواو سەرمەست نەبووینە با نوێنەرەکەی خۆتان پێشکێش بکەم)). ئەو سەری سووڕمابوو دەیویست بە هەر جۆرێك

بێت کپم بکاتەوە، بەڵام من دیسان تێیهەڵچوومەوەو وتم: ((ئەوەیە نوێنەری راستەقینەتان ئەو کەڵە نووسەرەی، کە توانیوویەتی زۆر بوێرانە ناوەندی دارەکە بگرێت و وێنەی ببێتە رەواجی هەمیشەیی گۆڤار و رۆژنامەکانمان.. بۆ ئەوەی زیاتر شارەزای بن، ئەو برادەرە ناتوانێت دڵی کەس بڕەنجێنێت، بە تواناو وەستاو پسپۆڕ لە کەف پێکردنی سابوون، زوڕناژەنی بە ئەدەب و داهێنەری نووسین و نوێنەری ئێوەی نووستوو.. جەنابی (حەربا)ی مرۆڤ و فەیلەسووف و شاعیر و چیرۆکنووس و هزرڤان)).. ویستم زیاتری بە خەڵکەکە بناسێنم، بەڵام ئەو بەمە توانی بموەستێنێت، کە یانەی بەجێهێشت و خەڵکەکەش بە چەپڵە دایان نیشاندم، جا نەمزانی ئەم چەپڵانە بۆ من بوون یانیش بۆ جەنابی (حەربا).

## ٩٣- دەنگ و باس

چی قسـه و باسـی ناشـیرین هـەبوو پێیگـوت، نـەفامی و زمـان نەزانینیشی درایە پاڵ، برادەرەکەی تەنیشتی لەم هەموو قسانە قێـزی دەبووەوە، بۆیە سەری خۆی دەلەقاند و هیچی نەدەگوت کـه باسـکراو گەیشـتە نزیکیـان قسـەکان ئۆتۆمـاتیکی گـۆڕان و ئـەمجارە بردیـە کەشکەلانی ئاسمان.. منیش لە نزیکدا ئەمەم بینی بەزەییم بە ئەدەب و رۆشنبیری هاتەوە کە ناوی ئەمانەی تێدابێ.

## ٩٤- خۆشەویستی و ڕق

هەموو لە چایخانە دانیشتبوون، نووسەرە درۆزن و ڕاستگۆکان، دەمامکدار و بێ ماسکەکان، قەڵەم فرۆش و قەڵەم جوانەکان.. ئەو برادەرە هاتە تەنیشتمەوە زۆر بێزار دیار بوو، ویستم باسی ئەدەبی لەگەڵدا بکەم، کەچی ئەو زۆر پێخۆشحاڵ بوو کە بە قسەم کرد و لەم کەش و هەوایانە دوورکەوتینەوە.. ئەو لێرە نەبوو وایدەزانی ئەگەر بێتەوە نیشتمانەکەی ئەوا ئیتر پاکیزەو فریشتەکان سروودی سەرکەوتنی بۆ دەچرن و قەڵەمی خۆیان دەکەن بە نانی هەژاران.. ئەوەندەی کە لێرەیە لە ئێمە زیاتر هەڵیسەنگاندوون، هەڵسووڕاندنی ئەم گۆڤارە وەهای بۆ ناساندوون، کە قێزی لە هەموو شتێکی پاکیش ببێتەوە، بڕیاریدا چیدی مەرەکەب نەکاتە پێنووسەکەی، کەچی لە تەنیشت ئەوەوە ئەو مامۆستایەی عاشقی چیرۆکە دانیشتبوو ئەوەندەی باسی چیرۆك و داهێنان و مرۆڤە پاکەکان کرد و بۆ پاکی پێنووسەکانی سووتابوو... منیش بووم بە عاشقێك و ئەوانەی هاوڕێی یەکەم باسی کردن و قێزی لێدەکردنەوە ئەوا بڕیارمدا نەفرەتیان لێ بکەم و ئەوانەی برادەری دووەمیش باسی کردن درووودیان بۆ بنێرم و گوڵبارانیان بکەم.

## ٩٥- قسەو کردار

هەمیشە خۆی لە چەقۆی دەسەڵات هەڵدەسووی و لـەلای خەڵکیـەوە یەکە یەکە پێیاندا دەهات و گلەیی و بوختانی بۆ فرێدەدان.. لە چایخانەدا کە لەناو ئەم هەموو ئەدیب و رۆشنبیرانە دادەنیشت بێزی لەو کەسانەش دەبووەوە کە هاموشۆی لێپرسراوانیان دەکرد و نووسەرانی بە پێچـەوانەی ئەو زاتانە لە قەڵـەم دەدا.. رۆژێکیـان بەرێکـەوت لـەلای لێپرسـراوێك دۆزیمەوە کە نە لە دوور نە لە نزیـك پەیوەنـدی بـە نووسـەرانەوە نـەبوو هەتاوەکو گاڵتەشی بەو توێژە دەهـات و نەیـدەزانی کـێن. بگـرە تاکـە رۆژنامەیەکی نەدەخوێندەوە.. کەچی ئەو پشتی خۆی ئەوەندە بـۆ نـەوی کردبوو خەریك بوو لەگەڵ مێزەکەی بەردەمی یەك ئاستیان وەردەگـرت. ئەو زاتە، یان ئـەو پاڵەوانـەمان ئەوەنـدەی پیاهەڵـدا وەك ئـەوەی نـانی هەژارانی گشت کوردستانی دابـین کردبـێ، وەك ئـەوەی تاقـە خـەمخۆری ئەدیبان بێ.. دوای ئەم ستایشە کـابرای پشـت مێزەکـە بـە فیزێکـەوە سەفتەیەك پارەی لـە گیرفـانی خـۆی دەرهێنـاو خسـتیە باخـەڵی. کـە سەیرێکی ئێمەی کرد ئارەقەی شەرمەزاری هەموو گیانی تـەڕ کردبـوو. وەك کەوانەیەکی چەماوە پشتی خۆی پێ راست نەکرایـەوە.. کـە چـووە دەرەوە، ژوورەکە پڕ بوو لە دوعا و پاڕانەوەو سوپاس.

# ٩٦- تیغی زوبان

بە رێکەوت لەناو کتێب فرۆشاندا کتێبەکەی ئەو شاعیرەی کەوتە پێش چاوان، ئەو برادەرەش هەرچی قسەی خراپ و نابەجێ هەبوو هەمووی دەقەبەڵ کرد، منیش سەری خۆم بۆ لەقاند و هیچ وەڵامێکیم نەدایەوە چونکە لەم بڕوایەدا بووم کە قسەکانی پێچەوانەی ئەو کەسەن کە من گەلێك هاوڕێی نزیکتری ئەوم و لە نزیکەوە ئاشنای بووم.. ئێوارە لە چایخانەدا لەگەڵ ئەو شاعیرە دانیشتبووم کە ئەو باسی دەکرد-کە هات و دیقەتی ئێمەیدا یەکسەر باوەشی پێیاکرد و ماچی کرد و بە شاعیرێکی بەرزی میللەتی ناوزەد کرد.. ئێستاش نازانم ئەو دوو روانینە هۆکەی ئەوەبوو ئەو وایزانی من قسەکانیم گێڕاوەتەوە یانیش هەر خۆی هەمیشە بۆ ئەو خەڵکە دوو لێدوانی هەیە و زوبانی تیغێکی دوو سەرەیە.. هیچم پێ نەما ئەوەندە نەبێ کە لە خوا بۆی پاڕامەوە، بەڵکو ئێ خوا ئەم زوبانە دوو سەرەی لێبسێنێتەوەو ئەم دەردەش لەناو برادەرانیتری چایخانەدا بڵاونەبێتەوە.

## ٩٧- جەژنی بڵاوکردنەوە

ساڵێك زیاتر بوو بەردەوام هەموو رۆژنامە و گۆڤار و تەنانەت ئێزگە و تەلەفزیۆنەکانیشی بەسەر دەکردەوە.. هەمیشە لە پۆستەی خوێنەران وەڵامی دەدرایەوە، جاری واش هەبوو کۆپلەیەکیان بۆ بڵاودەکردەوە.. کەچی ئەمجارە بەرێکەوت دوای نووسینی چەندان شیعر لە رۆژنامەیەك بۆیان بڵاوکردەوە.. هاتە ناو بازاڕ و پەنجا دانە زیاتری لەو رۆژنامە کڕی و لە چایخانەی مەچکۆ یەك یەك دەیدا نووسەرەکان و فیزێکی دەنواند. ئەوجا بە پێشنیاری برادەرەکەی دوو ژمارەی شیعرەکەی لە جام و چوارچێوە گرت و لە چایخانەدا لەسەر سەری ئەدیبان هەڵیواسی.

## ٩٨- پێناساندن

دەبوایە لە پرسگەکە دانیشم و وەك ئەو خەڵکە چاوەڕوانی نۆرەی چوونە ژوورەوە بکەم.. تازە هەتا جەنابی وەزیر نەیەتە دەرەوە ئیتر کەسێك بۆی نییە پێ بنێتە ئەم دەرگایە.. ئەو برادەرە درۆزنەشم لەوێ دانیشتبوو نەمزانی نە چاوەڕێی دیدەنی ئەم زاتەی دەکرد، نە جەنابی وەزیر.. دەیزانی کێ لە ژوورەوەیە بۆیە بەخۆ هەڵکێشانەوە وتی: ((خەمت نەبێت ئێستا بێتە دەرەوە پێتدەناسێنم و وادەکەم چ کارێکت هەبێت بۆتی جێبەجێ بکات..)) منیش هیچ قسەم نەکرد و سەری خۆم بۆ لەقاند.. دوای ماوەیەك کە جەنابی وەزیر هاتە دەرەوە تەماشایەکی منی کرد، وەستاو سەنگرایەوەو تەوقەی لەگەڵ کردم و لە چاکی و چۆنی باوکمی پرسی.. ئەم برادەرەش هێشتا رەق وەستابوو ویستی خۆی بێنێتە پێشەوەو وانیشان بدات کە دەیناسێ، جەنابی وەزیر لەمنی پرسی: ((ئەو کوڕە دەم بە پێکەنینە کێیە.. ناکا ئەوەش وەك تۆ نووسەر بێت.)). منیش بە جەنابیم ناساند، کە رۆیشتە دەرەوە خەڵکی ناو پرسگاکە پێکەنینیان بەم پێناساندنە سەیرە هات. ئەویش بێ ئەوەی خۆی تێکبدات بە سەرەخۆی نەهێناو پێیوتم: ((زانیم تۆ دەیناسی و ئەویش دەتناسێ بۆیە من بە یەکتریم ناساندن.. باشتریش پێناساندنەکە لە یاخەی من بووەوە.)).

## ٩٩- پشوو

ئۆخەی ئێستا بە ئاسوودەیی دەخەوم و دەخۆم و بیردەکەمەوە.. ئێستا لەناو خێزانەکەمدا بە تەواوی ئۆقرە دەگرم.. چیتر خەمی کرێچیاتیم بە کۆڵەوە نەماوە.. ئەوا قەرزی برادەرە خۆشەویستەکانیشم دانەوە، ئەوانەی وەك فریشتە ئارامیان پێبەخشیم و مێشکی جەنجاڵیان حەساندمەوە، چونکە جاران نەمدەزانی نە بۆ کرێی خانوو هەوڵبدەم نەبۆ بژێوی خێزانەکەم، ئێستا لایەکم کەوتە سەر زەوی.. ئێستا هەست بەمە دەکەم کە زۆر ئاسوودەم، تا بەم شێوەیەی خۆم وەك پاشای مەملەکەتێك دێتە بەرچاو، بەلاّم مەملەکەتی ئەدەب نەك دنیای سیاسەت کە هی ئێمە مانان نییە.. بۆیە بڕیارمدا بەم بۆنەوە چیرۆکێکی نوێ بنووسم و ناوی بنێم وێستگەی پشوودان.

## ١٠٠- ئاو

ماڵەکەی ئەوەندە وشك و برینگ بوو هەتا بایی دەم و چاو شووشتنیش ئاوی نەبوو.. لەگەڵ پرتەو بۆڵەی خێزانەکەی، لە ماڵەوە دەرپەڕیە دەرەوە.. چوو بۆ ئاو کڕین، لەوێ کە سەیری گیرفانی خۆی کرد دەرهەقی کڕینی نەدەهات.. پارەی تانکەرێك ئاو دەیکردە نیوەی مووچەکەی.. هیچ چارەی نەما.. بڕیاریدا لەم تەنگژەیە باشترین شت بەلایەوە ئەوە بێت کە شیعرێك بنووسێت رەنگرێژی ئەم خەمانەی بێت و ناوی بنێت (ئاو)، بەلام بیری هاتەوە کە (ئاو) ناونیشانی دیوانە شیعرێکی (ع. ع. یووسف)ەو لە ساڵی ١٩٧٤ چاپکراوە.. بۆیە وازی لە نووسینی شیعرەکە هێناو وایهێنایە بیرکردنەوەی خۆی کە ئاوی کڕیووە.. بەلام تا گەڕایەوە ماڵەوەش هەر لەبەر خۆیەو دەیگووت: ئاو.. ئاو.. ئاو.. ئینجا پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر ئەم هەموو وشانەی (ئاو)ی بەشێوەیەکی ئەندازەیی و هەڕەمی ریزکردن و کردی بە شیعرێکی وێنەیی...

# لایەنی هونەری
# لە وێنەی چیرۆکی ئاوێنەکانی سابیر رەشیددا

د. عادل گەرمیانی

هەموو وێژەیەك (Literature) لە کەلچەری جیهانیدا زەمینەیەکی باشە بۆ لەدایکبوونی رەگەزی وێژەیی تازە پرۆژەیەکی ئامادە و کراوەیە، چونکە وێژە، وەك بەرهەمێکی ژیاری و مرۆڤایەتی، خاوەن گیانێکی هەمیشە زیندووە لە جەستەیەکی نەرمولەی وەها دەتوانێ ژانێك و کشانەوەیەك لە زایەڵەی خۆی بۆ لە دایکبوونی رەگەزە تازەکە ئامادە بکات. وێژەی کوردیش، وەك وێژەی نەتەوەکانی دیکەی جیهان، لە کۆن و ئێستادا ئەو دیاردە وێژەییەی پێوە دیارە، بەڵام هەمیشە درەنگ وەخت و لە پاش چەندین ساڵ رەگەزە تازەکانی وێژە تێیدا لەدایك دەبن، پاشان دەتوانێ بەردەوامی، یان نەمری بۆ ئەو رەگەزانە دابین بکات.

کۆششــەکانی گۆگــۆل (١٨٠٩-١٨٥٢) و ئــەنتوان چــیخۆف (١٨٦٠-١٩٠٤) لــە وێــژەی رووســیی ســەدەی نۆزدەهــەم زەمینــە خۆشکەرەوە بوون بـۆ سـەرهەڵدانی کورتـە چـیرۆك وەك پەخشـانێکی هونەری تازە لە وێژەی رووسی و جیهانیدا. تەنانەت مەکسیم گۆرکیی چیرۆکنووس و رۆماننووس بەڕاشـکاوی وتوویـەتی: (هـەمووان لـەژێر پاڵتۆکـەی گۆگۆڵـەوە دەرچـووینە)، ئـەو جـۆرە کۆششـانە پاشـتر بەشێوەیەکی هونەر دی و باشتر لەسەر دەستی گـی. دی. مـۆ پاسـان (١٨٥٠-١٨٩٣) لـە وێـژەی فەرەنسـەیی پێشـکەوت، ئـەم هونـەرە وێژەییە تازە لەو رۆژگارەوە تا ئەم رۆژگارە توانیویەتی سەقامگیر بـێ و ببێتە خاوەن کەسایەتی و بنـەمای هونـەری خـۆی، پـاش جـەنگی یەکەمی جیهانی لە نوێ وێژەی کوردی سەریهەڵدا و تا ئـەم رۆژگـارە بەردەوام بوو. تەنانـەت زایەڵـەی رەگـەزی کورتـە چـیرۆك ( short story) رەگـەزێکی دیکـە تـازە دەرکـەوتووە پێیـدەوترێ کورتیلـە چیرۆك (short short story) یان (short story) دەتـوانین کۆ کورتیلە چیرۆکەکانی (هەڵچوونەکان)ی ناتـالی سـارۆت (١٩٠٠-....) لە پاش جەنگ دووەمی جیهانی بە سەرەتای ئەم رەگەزە تازەی کورتە چیرۆك دانبرێت، کەوا لە ساڵانی هەفتاکانەوە کورتیلە چیرۆك لە وێـژەی کـوردی هاوچـەرخدا دەسـتی بەسـەرهەڵدان و گەشەسـەندن کردووە.

لە بواری کورتیلە چیرۆك لـەم رۆژگارەمانـدا چـەند نووسـەرێکمان هەیـە وەك: (ئیسـماعیل رۆژبـەیانی و سـابیر رەشـید) کـەوا دوو ئەستێرەی گەشەداری بـەردەوامی کورتیلـە چـیرۆکی کـوردین، جگـە لەمانە چەند چیرۆکنووس و هۆنیاری (شـاعیر)ی دیکـەمان هەیـە لـە بـواری کورتیلـە چـیرۆکدا بـە خامـەکانیان چـەندین دەقیـان پێشکێشکردووەو دەبێ مێـژووی وێـژەی کـوردی هاوچـەرخ گـەواهی بەشداربوون لەم بوارەدا بۆ ئەم نووسەرانە بـدەن: (رەئـووف بێگـەرد و ئیسماعیل رۆژبەیانی و سابیر رەشید و عەبدوڵڵا سەڕاج و رەزا سـەید گوڵ بەرزنجی، ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل، عەباس عەبدوڵڵا یووسـف، رۆسـتەم باجـەلان، کـەمال سـەعدی، موکـەڕەم تاڵـەبانی، عـادل گەرمیانی) و... چەند نووسەرێکی دی ناتوانم لێرەدا سـەرجەم ناویـان بهێنم، کەوا هەمووان جاروبارێك کورتیلە چیرۆك بڵاودەکەنەوە، جگـە لە ئیسماعیل رۆژبەیانی کەوا بـە رۆمـانی (نـازە) سەرنجڕاکێشـەکەی دەرگای رۆمـانی کـوردی لـە سـەرەتای سـاڵانی هەشـتاکاندا واڵاتـر کردەوە، بـەڵام زوو لـەم هونـەر پاشەکشـێی کـرد بـێ ئـەوەی بـزانین هۆکارەکەی چییە، بە گەرمی بـۆ چـەندین سـاڵ لـە بـواری کورتیلـە چیرۆکدا هەنگاوی دیاردەنێت خوا یار بێ لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتم بـە دەستەوەیە لەبارەی کورتیلە چیرۆکەکانی. هەروەها (سـابیر رەشـید)ی چیرۆکنووسـیش لـە بـواری کورتیلـە چـیرۆك بەردەوامـە لـە دەق

پێشکێشکردن زیاتر لەوەی (کەمال سەعدی) چیرۆکنووس لە بواری کورتیلە چیرۆك پێشکێشی دەکات هەرچەندە هەردووکیان پێکەوە لە کۆتایی ساڵانی حەفتاکاندا کۆ-چیرۆکێکیان چاپکرد. لێرەدا هیوادارم دەستی یارمەتی بۆ چاپکردنی سەد کورتیلە چیرۆکەکانی (سابیر رەشید) کەوا بە ناونیشانی (ئاوێنە)یە درێژ بکرێت.

لە راستیدا جگە لە چیرۆکی درێژ (Long story) کەوا ژمارەی وشەکانی لە نێوان (٥-٣٠) هەزار وشەیە، کورتە چیرۆك ( short story) کەوا ژمارەی وشەکانی لە نێوان (٢-٥) هەزار وشەیە، کورتیلە چیرۆك (shorter story) کەوا ژمارەی وشەکانی لە نێوان (٥٠٠-١٥٠٠) وشەیە. جگە لەمانە سێ رەگەزۆکەی دی چیرۆکمان هەیە هەندێ لە نووسەرانمان لەوانەیە بێ ئاگا لە سروشتی هونەریان پێشکێشی دەکەن، بریتییە لە:

١- وێنەی چیرۆکی (image story) کەوا بەلامانەوە ژمارەی وشەکانی لە نێوان (٢٥-١٠٠) وشەیە.

٢- وێنەی پێنووسی (image pen) کەوا بەلامانەوە ژمارەی وشەکانی لە نێوان (٥٠-٢٠٠) وشەیە و تێیدا ژیاننامەی کەسێك، یان نووسەرێك دەخرێتەڕوو.

٣- وتاری چیرۆکی (Essay story) یا (Report story) کەوا ژمارەی وشەکانی بەلامانەوە لە نێوان (١٠٠-٥٠٠) وشەیە و

تێیدا سەرگوزەشتەی رووداوێك لــە ریپۆرتــاژی رۆژنامەنووســی، یــان راپۆرتێکی دادگایی لەمەڕ چۆنێتی نواندنی تاوانێك دەخرێتەڕوو.

بنەما، یــان لایەنــە هونەرییــەکانی وێنــەی چــیرۆکی، کــەوا لــەم لێکۆڵینەوەیەمان مەبەســتە لەمــەڕ ئاوێنــەکانی (ســابیر رەشــید)دا، بریتییــە لــە: ســەرەتایەکی کــورت (short exposition) و، گێڕانەوەیـــــەکی خەســـــت (densification narrative)، چرکەســاتێکی دیــاریکراوی کــورت و شــوێنێکی تایبــەتی بچــووکی هەڵبــژێردراو و تــەنیا یــەك پاڵــەوان، یــان کەســی ســەرەکی و تــەنیا رووداوێکی زۆر بە شارەزایی هەڵبژێردراو بۆ گەیاندنی بیرێك ئامــانجی سەرەکیی دارشتنی وێنەی چیرۆکییە، کــەوا لــە راســتیدا بــە کرۆکــی وێنەی هونەری نێو کورتیلــە چــیرۆك دادەنرێــت نــەك خــودی تــەواوی کورتیلــە چــیرۆکە کــەوا (ســابیر رەشــید) بــە هەڵــە ئــەم زاراوەی لــە ئاوێنەکانی ناوە، چونکە جگە لەو بنەما هونەریانەی وێنەی چــیرۆکی چەند لایەن و بنەمای هونەری دیکە هەیە دەبێ لە کورتیلــە چــیرۆکدا هـــــەبێ وەك: گرێچـــــنی بچـــــووك (small plot) و گفتوگـــــۆ (daloque) و وێنەی هونەری (imagery).

ســەرەتا دەبێ ئەوە بلێم و روونبکەمەوە کەوا بــەکارهێنانی وشــەی ئاوێنەکان لەلایەن (سابیر رەشید)ەوە بۆ ئەو حەڤدە دەقە کورتــەی لــە لاپــەڕەکانی (١٠٧-١٠٩)ی ژمــارە (١٣)ی خــولی ئــازادی ســاڵی

(١٩٩٥)ی گۆڤاری کارواندا زۆر نزیکە لە چەمکی وێنەی چیرۆکیی و بەهیچ شێوەیەك ناچنە نێو خانەی کورتیلە چیرۆکەوە وەك خۆی لە سەرەوەی ناونیشانی (ئاوێنەکان) داینـاوە، یـان بۆیانـداناوە، چـونکە سروشتی ئەم حەڤدە دەقەی، کەوا بۆ هەریەکەیان ژمارەیـەکی لەگـەڵ وشەی ئاوێنە دانـاوە، بـە تـەواوی سـەرجەم بنـەمای هونەرییـەکانی کورتیلە چیرۆکی تێیدا نییە، بەڵکو زیاتر بنەماکانی وێنـەی چـیرۆکی تێدایە، هەندێك لە ئاوێنەکانی لـە چـەمکی وێنـەی چـیرۆکیش دوور دەکەونەوەو لە برووسکەبیر نزیك دەبنەوە وەك لە ئاوێنە (١)دا هەیـە: (ئەم ئاوێنە بچکۆلانەی بەر باخـەڵم، قـەت هەڵـە ناکـات، هەمیشـە وێنەی مردووی خۆم نیشاندەدا)، چونکە لەم ئاوێنەدا تەنیا زمـانێکی هونەریی و بیرۆکەیەکی سەرنجڕاکێشی هێمـاداری هەنـدێك جەڤـەنگی بەدی دەکەین، باشترین ئاوێنەکانی ژمارەکانی (٦، ١٠، ١٥)یە کەوا لایەنەکانی بینای هونەری وێنـەی چـیرۆکی تێیانـدا بـەدی دەکـرێ و سەرجەم ئاوێنەکانی دیکە هەوڵی خستنەڕووی رووداوێك دەدەن، بەڵام لەبەر ئەوەی چیرۆکنووس ئاوێنەکەی تەڵغ کردووە بەهۆی زمانە پڕ لـە وشەی هێماداری و جەڤەنگییەکانی پەیام وەرگرەکانی، بە ئاسانی لـە شەوقی وێنەی چیرۆکی نێو ئەو ئاوێنانە تێناگات، هەرچـەندە لێـرەدا لایەنی رامیاری رووداوەکانی نێـو ئـەم وێنانـە لەوانـەبێ وەهـای لـە چیرۆکنووس کردبێ ئەمجۆرە ئاوێنـە تەڵخانـە بـەکاربهێنێ نموونـە لـە

ئاوێنــــه (٧)دا دهڵێــت: (منـــدالآنی شـــارهکهم ورده ئاوێنـــهکانیان کۆکردهوهو نهخشهیهکی تازهیان لێدروست کـرد.. رمبازهکـان هـاتن مردووستانیان لهسهر نووسی و کردیان به وانهی جوگرافیـا). لـهجۆره وێنهی نێو ئاوێنهکه، کۆتاییهکهی ههوڵی ههندێ تیشـك بهخشـین بـه سروشـتی رووداوه جهڤـهنگی و هێمادارهکـه دهدا، بـهڵام لایهنـهکانی کات و شوێنی زۆر نادیار و تهمومژاوییه.

ئهجۆره تهڵخی ئاوێنه، لـه وێنـهی نێـو ئاوێنـهی (١٣)ش بـهدی دهکرێت، زمانه هێمادار و جهڤهنگییهکهی ئاشکرای پهیامی رامیاری رووداوهکهی بۆ خوێنهری زیرهك و ئاگا له رووداوهکانی چهند سـاڵێکی بهر له ئێستای شاری چیرۆکنووسه کاتێـك دهڵێـت: (دوێنـی خـهڵکی شارهکهم له سێبهریشی دهرهوینهوه.. ئهمرۆ دۆسته و بجوولێتـهوه وهك نههەنگ سـهدان کـهس لـهبن دهسـت و قاچـیدا دهپلیشـێنهوه.. کـه مهملهکهت بوو به شهوهزهنگ، بوو بـه پالـهوانی شـهڕ، خهڵاتهکـهی کورسییهکی زێڕین بوو.) پهیامی ئهجۆره وێنهی نێـو ئاوێنـهی (١٣) کهوا ژمارهیهکی شوومه بهلای زۆربـهی خهڵکـهوه لـه ئاوێنـه (١٦) ههنــدێ زیــاتر رووندهکرێتــهوه کاتێــك دهڵێــت: (هــهموو رۆژێــك ئاوێنهیهکی نوێم دێنا و له دهرگای قهڵام دادهنـا.. خـهڵکی شـارهکهم پێی بهختهوهر بوون. شـهوان ناکـهس بهچـهکان دهیانشـکاند.. لهبـهر

ئەوان چیدی نەوێرام بەم ناوەشدا بچم.. سێرەیان لێگرتبوو ئەوەی لە قەڵاکەش نزیك دەبووەو خڵتانی خوێنیان دەکرد).

ئاوێنەکانی (سابیر رەشید) هەوڵی بەدەستەوەدانی هەندێ وێنەی فۆتۆگرافی بەسەرهات و رووداوەکانی شارەکەی، شاری هەولێر لە ساڵانی نەوەتەکاندا بخاتە بەر دیدەی خوێنەری دەقی ناو ئاوێنەکانی دی، لە ئاوێنە (١٤)دا وێنەیەکی فۆتۆگرافی رووداوێکی شەقام و بازاڕی شێخەڵڵای خستووەتەڕوو (رۆژنامەنووسە بیانییەکە کە گەیشتە بازاڕی شێخەڵڵا.. (راستترە بڵێت شێخەڵڵا.. عادل)، کامێراکەی خستەکار، وێنەی جۆراوجۆری دەگرت.. خەڵکەکە لە خۆشیان شاگەشکە بوون.. بۆ ئەوەی وێنەکانیان دەربچێت، دەستە دەستە خۆیان دەخستە پێش کامێراکەی.. هەر هێندەم زانی خەڵکی شار هەموو رژانە ئەوێ، بوو بە شایی و دەهۆڵ و زوڕنا.. هەموو هاتن بۆ ئەوەی ئەم ئاهەنگە خۆشە بە خەڵکی رابگەیەنن).

خودی وێنەی چیرۆکی لە کورتیلە چیرۆك کورتیلەترە و بە هیچ شێوەیەك دەستکارییەکی تاقیگەرانە هەڵناگرێت نەخاسمە ئەم چیرۆکنووسە بێت و بە دوو دڵییەوە چاوەڕوانی رەزامەندی رەخنەگران بێ ناوی کورتیلە چیرۆك لەو بەرهەمانە بنێت. لە ئاوێنە (١٧)دا رستەیەکی برووسکداری رەزا سەید گوڵ بەرزنجی چیرۆکنووس (دایە گیان خواحافیز) بکاتە (دایە گیان خواحافیز، بەڵام بەرەو هەندەران) و

لە هەر وشەیەك لەمانە پیتی سـەرەتاکەی هەڵـژێرێت و هەوڵـدانێکی تاقیگەرییانەی خۆی بخاتەڕوو بیکاتە (د. خ. ب. ه!!) و نـازانم پیتـی سەرەتای وشەکانی (گیان، حافیز، بەڵام)ی بۆچـی لـەم کورتکارییـەی لەبیر کردووە تەنانەت خودی ئەم ئاوێنە دوورە لە داڕشتنی چیرۆکیی و نزیکە لـە روونکردنەوەیـەك بـەم شـێوەیە بۆچـوونێکی خـۆی لەمـەڕ نیازێکی یان ئومێدێکی دەخاتەڕوو:

(کورتترین چیرۆکی کوردی تا ئێسـتا خوێندبمـەوە ئـەوەبوو "دایـە گیان خوا حافیز!!".. منیش دەمەوێ لـەو بـرادەرە کـورتتر بنووسـم، بۆیە دەبێ بڵێم "دایە!!".. یان بڵێم "خواحافیز".. یـان "بـای بـای" بەدڵم نەبوو بۆیە بیرۆکەیەکم بـۆ هـات، کـە بڵـێم "دایـە گیـان خـوا حافیز!! بەڵام بۆ هەندەران!!".. کە سەیرم کـرد لـە چـیرۆکەکەی ئـەو برادەرە درێژتر بوو.. بۆیە بڕیارمدا کـە هـەر لـەم رسـتەیە سـەرەتای تیپەکان هەڵبژێرم، ئەوسا چیرۆکەکەم بەم شێوەیە دەبێـت "د. خ. ب. ه!!" ئیتر نازانم خوێنەران ئەم مۆدیلە چیرۆکەم لێوەردەگرن، یان نـا.. رەخنەکاران حیسابی وردترین چیرۆکی کوردیم بۆ دەکەن یان نا، ئەگەر کرا کابرایەکی سەر بە شـەپقەم بـۆ بکـەن بەناونیشـانی چـیرۆکەکە و ئاوێنەکەی بازاڕی شێخەڵلاش لەسەر سەری بێ و بای بای لێبکات بۆ هەندەران..).

لێرەدا، نەك تەنیا من، بەڵكو سەرجەم خوێنەرانی ئەم بیرۆكەی (سابیر رەشید) بە كورتیلەترین چیرۆك دادەنێن؟؟! و، نازانم سابیری خاوەن تێڕوانینی رەخنەیی زانیاری زۆر و باش لەمەڕ چیرۆكی كوردی و هونەری چیرۆك بەگشتی چۆن قایل بێ، یان قایل بوو، زاراوەی كورتترین چیرۆكی كوردی بۆ ئەو بیرۆكەی بەكاربهێنێ هەتا ئەگەر لە دڵی خۆیدا نیازی بەكارهێنانی تازەترین شێوازی تاقیگەری بێت لەو ئاوێنەیەدا..!!؟.

باشترین ئاوێنە لەنێو ئاوێنەكانی بۆ دەرخستنی وێنەی چیرۆكی ئەوەی لەنێو ئاوێنە (١٠) دایە، چونكە سەرەتایەكی باش و كۆتاییەكی باشتر و رووداوێكی پڕ لە بیری بەهادار و پاڵەوانێكی هۆشمەند و گێڕانەوەیەكی كاریگەری تێدایە بۆ رەنگدانەوەی دوو جیهانی لێكنەچوو لەوانەیە وەك پێشبینینێك بەهۆی سروشتی ژیانی نێو جیهانی زێرابێكەوە بۆ مرۆڤی كوردی هاوچەرخ پێشكێش بكات، ئەگەر بە هۆشمەندییەوە چارەسەرێك بۆ هەندێ كێشە و رەفتاری كۆمەڵایەتی ئەم رۆژگارە نەدۆزێتەوە. ئەو رێككەوتەی كەوتنی ئاوێنەكەی نێو باخەڵەكەی بووەتە سەرەتایەكی باش بۆ شۆڕبوونەوەی خوێنەرانی دەقی ئەم ئاوێنەیە بەرەو ئەو جیهانەی چیرۆكنووس دەیەوێ لە ئاستیدا بە ئاگامان بهێنێ و رەخنەی كاریگەری لێبگرێ، لەم ئاوێنە ژمارە (١٠)یە دەڵێت:

( خۆم دانەوانەوە، ئاوێنەکەی ناو باخەڵم لێکەوتە ناو زێرابێکەوە، کە شۆڕبوومەوە ناوی دەربێنم، سەیرم کرد جیهانێکی دی بوو خەڵکی ئەوێ گۆشتی سەگیان دەخوارد.. لەگەڵ خوشك و دایکی خۆیان جووت دەبوون.. زەلامیان وەك چۆلەکە سەردەبڕی.. دزو جەردەکانیان لەباتی گیران، خەڵات دەکران، نەدارەکانیان لە دیار مێزی رازاوەی گەورەکان تێر دەبوون.. باش بوو زۆر لەوێ نەمامەوە، کە ئاوێنەکەم دۆزیەوە بە هەڵەداوان هاتمە دەرەوە. دەنا شتی سەیر و سەمەرەتریشم بۆ دەگێڕانەوە..!).

ئێمەش دەڵێین: خۆزگە ئاوێنەکانی دیکەشی لەم ئاستە بوایە بۆ بەپێش چاوخستنی چەند دیمەنێکی وەها سەرنجڕاکێش لە نێو راستی ئەتواری کۆمەڵەکەمان، لێرەشدا ئەگەر زیادەڕۆییم نەکردبێ ئەوا دەڵێم: (سابیر رەشید)ی چیرۆکنووس بەمجۆرە ئاوێنانە بووەتە پێشەنگی رەگەزۆکەیەکی وێژەیی تازە لەنێو وێژەی هاوچەرخمان ئەویش رەگەزەکەی وێنەی چیرۆکییە کەوا لە راستیدا کرۆکی وێنەی هونەری نێو کورتیلە چیرۆك و بەجیا و بەشێوەیەکی سەربەخۆ بۆمان بەرجەستەی کردووە، بە ئەوپەڕی شانازییەوە پیرۆزبایی لەم داهێنانە تازەی ئەم چیرۆکنووسە هاوچەرخەی چیرۆکی کوردیمان دەکەم.

* سەرچاوە: گۆڤاری (کاروان) ژمارە (١٣٤) ساڵی ٢٠٠٥.

# هونەری کورتیلە چیرۆك: (سابیر رەشید) وەك نموونە

د.سەمەد ئەحمەد

## هونەری کورتیلە چیرۆك

کورتیلــە چــیرۆك، زادەی گەشــە و گــۆڕانی کورتــە چــیرۆکە و هونەرێکی خۆڕسکی کوردی نییە، بەڵکو لە ئەنجامی گەشە و کارلێك و لاساییکردنەوەی هونەر و نووسینی گەلانیترەوە هاتۆتە نــاو ئــەدەبی کوردییەوە.

ئەم هونەرەی نووســین، لای ئێمــە هــەر لــە ســەرەتاوە کاریگــەری ئەدەبی گەلان بەگشتی و بەتایبەتی ئەدەبی عەرەبی و فارسی لەســەر بووە، بەڵام دواجار چیرۆکنووســانی کــوردیش توانیوویــان شــارەزایانە مامەڵە لەگەڵ ئەم ژانرەی ئەدەبدا بکەن و ببنــە خــاوەنی ناســنامە و دەنگی تایبەتی خۆیان.

کاریگـەری و کـارلێکی کولتـووری نەتـەوەکان لەسـەر یەکـدی، حاڵەتێکی ئاساییە و نەك هەر لە ئەدەبدا، بـەڵکو لـە هـەموو کایـە جیاجیاکاندا بەرچاو دەکەوێت.

کولتـووری هـیچ نەتەوەیـەك گەشـە ناکـات ئەگـەر دەرگاکـان لەسـەرخۆی واڵا نـەکات و ئامـادەیی نـەبێت بـۆ وەرگـرتن، یـان لاساییکردنەوەی سیما گەشەکانی کولتوور و داهێنانی نەتەوەکانیتر.

یۆنانییەکان کـە خۆیـان سەرچـاوەی زۆر لـە داهێنانـە ئـەدەبی و فیکرییـەکانن لاسـاییکردنەوە بـە بەشـێکی گـرنگ و تەنانـەت بـە فاکتەرێکی بنەڕەتی ئیستاتیکای هونەری دادەنێن. بۆیە زۆر ئاسـاییە کە کوردیش لە کورتیلە چیرۆکدا لاسایی گەلانیتر بکاتەوە.

ئێسـتا چیرۆکنووسـانی کـورد بەشـێوەیەکی بـەرفراوان و بەرچـاو مامەڵە لەگەڵ کورتیلە چیرۆکدا دەکەن، کە دەتـوانین بڵـێین بـووە بـە دیاردەیەك و تاڕادەیەکیش خەسڵەتێکی کوردانەی پێوە دیارە.

بێگومان زۆربەی ئەو کورتیلە چیرۆکانەی کە نووسراون لە ئاسـتی پەسـەند و پێویسـتدا نـەبوون و نـین، بـەڵام سـەرەتایەکی باشـن بـۆ بونیادنانی پرۆژەیەکی گەورە لە ئایندەدا. ئەمە مانای ئەوە نییـە کـە هەتا ئێسـتا چیرۆکنووسـانی کـورد لـە نووسـینی کورتیلـە چـیرۆکدا خاوەنی دەنگ و داهێنانی خۆیان نەبوون، نەخێر ئێمە وایـدەبینین کـە

کورتیلە چیرۆکەکانی (عەبدوڵڵا سەڕاج) و (ڕەئووف بێگەرد) هیچیان کەمتر نییە لە شاکارە جیهانییەکان.

ئەگەر لەڕووی هونەریشەوە قسە لەبارەی ئەم ژانرەی ئەدەب بکەین دەبێت بڵێین: کە کورتیلە چیرۆك چڕکردنەوەی هەموو پێکهاتە و ڕەگەزەکانی کورتە چیرۆکە لە پنتێکی بچووکدا.

ئەگەر بیرۆکە لە کورتە چیرۆکدا ڕەگەزێکی گرنگ بێت، ئەوا لە کورتیلە چیرۆکدا گرنگترەو کاری مەزنتری لە ئەستۆدایە. چونکە لە کورتە چیرۆکدا دەشێ لە ڕێگای بەکارهێنانی دایەلۆگ و مەنەلۆگ و فلاش باك و جۆرەکانیتری تەکنیکەوە، درێژە بە ڕەوتی چیرۆکەکە بدرێت، ئیدی لە درێژەی ئەو کاروانەدا بە شێنەیی مەبەست و بیرۆکەکە نیشاندەدرێت.

بەڵام لە کورتیلە چیرۆکدا مەودای کارکردن بەرتەسکترە، بۆیە دەبێت زۆر لێزانانە مامەڵە لەگەڵ وشە و ڕستەکاندا بکرێت، بەجۆرێك، کە بتوانرێت بە کەمترین وشە و ڕستە، گەورەترین وێنە و مەبەست نیشان بدرێت.

لەڕووی هونەرییشەوە زۆرجار و بە پلەی یەکەم لە کورتیلە چیرۆکدا ناوەرۆکی سەرەکی بیرۆکەکە دەکەوێتە کۆتایی و تەنانەت دوادێڕی دەقەکەوە.

بەکورتی بڵێین: لە کورتیلە چیرۆکدا زیاتر سەرنجە خێراکان دەنووسرێنەوە. بێگومان زۆرجار سەرنج و تێبینییەکانی مرۆڤ لەسەر دەوروبەری شایانی ئەوە هەن کە بنووسرێنەوەو لە دەقێکی ئەدەبیدا دابڕێژرێن و بخرێنەڕوو.

ئەگەر سەرنج بدەین (گۆران)ی شاعیر لە سەرنجێکی زۆر تیژڕەودا، جوانترین دەقی شیعری هێناوەتە بەرهەم، کە شیعری (دوا سەرنج)ە. ڕەنگە هەموو کات زەمینەی ئەوە لەبار نەبێت هەموو سەرنج و تێبینییەکان لە دەقێکی نەفەس درێژدا چێبکرێت و بنووسرێت، بەڵام ئاساییە و دەتوانرێت لە دەقێکی کورتخایەن و بچووکتری وەك کورتیلە چیرۆکدا هەمان بیرۆکە و سەرنج و تێبینی چڕ بکرێتەوەو بگەیەنرێت بە خوێنەر. کەچی ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئەو بیرۆکەیەی لە کورتیلە چیرۆکدا بەکاردەهێنرێت هەڵگری دیدێکی قووڵ و زیندوو نییە، نەخێر زۆرجار بووە کە بیرۆکەی کورتیلە چیرۆکێك فراوانکراوەتەوەو رۆمانێك، یان فیلمێکی سینەمایی مەزنی لێ بەرهەمهێنراوە.

ڕەنگە ئاسان نەبێت، یان کارێکی نەشیاو بێت کە مەرجی تایبەتی لەسەر چۆنییەتی نووسینی دەقێك بۆ نووسەر دابنرێت، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە هەر نووسەرێك لە چوارچێوەو تایبەتمەندی کارەکەیدا قەڵەمی خۆی لەسەر نەخشاندنی تەکنیك و خستنەڕووی

هەر بیرۆکەیەکدا بخاتە کارو ڕێگای تایبەتی و دیاری خۆی ون نەکات، هەروەها لە دەربڕینیشدا خۆی لە زیادەڕەوی و تەمومژ و گرێ و گۆڵی زمان بپارێزرێت.

بەکورتی بلێین: پێویستە نووسەر پەیوەست بێت بە پێکهاتە و خاڵە بنەڕەتییەکانی ئەو دەقەوە، کە کاری تێدا کردووە. بێگومان کورتیلە چیرۆکیش هونەرێکی تەواو سەربەخۆیە و خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەیە، کە دەتوانین بە سێبەری شیعریش ناوی ببەین.

بۆیە زمان و بیرۆکە بە بڕبڕەی پشتی کورتیلە چیرۆک دادەنرێت و لە پلەی دووەمدا تەکنیك و پاڵەوان ڕۆڵی خۆیان دەبینن..

لە دوای ئەم سەرەتایە لەسەر هونەری کورتیلە چیرۆك و لەم دەروازەیەوە دەمانەوێت موتالای چەند کورتیلە چیرۆکێکی(*)، چیرۆکنووس و ڕەخنەگر (سابیر ڕەشید) بکەین، بەڵام سەرەتا دەبێت ئەوە بەیان بکەین کە ئێمە تەنیا بیرۆکەی کورتیلە چیرۆکەکانمان راڤە کردوە و خۆمان لە قەرەی لایەنەکانیتری پێکهاتەی دەقەکان نەداوە، ئەمەشمان بە مەبەست کردووە.. چونکە (سابیر ڕەشید) لەو کورتیلە چیرۆکانەدا، لە دەورو خولی یەك بابەت دەسووڕێتەوە، ئەویش ڕەخنەکردن و سکاڵایە لە ڕەوشی ئێستای نووسەران و ئەدیبان و ڕۆشنبیران، کە چەند بنیادەمێکی دەمامککراو و عاجباتین.

لێرەوە هەوڵدەدەین بیرۆکەی کورتیلە چیرۆکەکان بەجیاو سەربەخۆ هەڵسەنگێنین:

**دیوانە شیعر:**

کێشەی زۆرێك لە نووسەرانی ئەمڕۆی تێدا خراوەتەڕوو، کە بەهۆی هەژاری و نەدارییانەوە ناتوانن بەرهەمەکانی خۆیان چاپ بکەن، بۆیە ناچار دەبن، کە لەلایەك روو لە دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوە بکەن. کە کەمینەیەك لە نووسەران نەبێت، زۆرینە شانسی ئەوەیان نابێت، کە ئەو دەزگایانە ئەو ئەرکەیان بۆ بگرنە ئەستۆ. لەلایەکیتر دەبێت برێك لە پێداویستی ناوماڵی خۆیان بفرۆشن ئینجا دەتوانن بەرهەمێك چاپ بکەن.

پاڵەوانی ئەم کورتیلە چیرۆکە، لە دوای ئەم دوو هەوڵە هێشتا ناتوانێت دیوانە شیعرییەکەی چاپ بکات، بۆیە ناچار دەبێت، کە چەند دانەیەك لە دیوانەکەی بە کاربۆن بنووسێتەوەو بەسەر چەند رەخنەگرێك و دەزگایەکی رۆژنامەنووسیدا دابەشی بکات، بەڵکو ناوی بکەوێتە ناو ناوانەوە.

کاتێکیش بە هەزار دەردەسەری شاعیران دیوان، یان نامیلکەیەك چاپ دەکەن، کەچی لە بازاڕ و لەلای خوێنەران هیچ پێشوازییەکی لێناکرێت، بۆیە دواجار هەندێك لە نووسەران ناچار دەبن کە بەرهەمە

چاپکراوەکەی خۆیان بە زەرف فرۆشەکان بفرۆشن.. کە ئەمەی دواییان نووسەر لە کورتیلە چیرۆکی (نامیلکـە)دا بەرجەسـتەی کـردووە. لـە راڤەی ئەم کورتیلە چیرۆکەوە دەگەینە چەند دەرئەنجامێك:

١- برێك لـە نووسـەران لـەڕووی ئیمکانـاتی مادییـەوە توانـای چاپکردنی بەرهەمەکانیان نییە.

٢- دەزگاکانی چاپ و بڵاوکردنەوە گەندەڵییەکی زۆریان تێدایـە، ئەوەندەی هاوڕێیەتی و مەحسوبییەت لە لەچاپدانی بەرهەمـدا لەبـەر چاو دەگیرێـت، نیـو ئەوەنـدە نـاوەرۆك و پێکهاتـەی دەقـەکان، یـان بەرهەمەکان لەبەرچـاو نـەگیراون بۆیـە ئەوانـەی لـە ئـەمڕۆدا چـاپ دەکرێن زۆریان نەك هەر شایەنی خوێندنەوە نین، بـەڵکو بـارن بەسـەر دنیای ئەدەب و رۆشنبیرییەوە.

٣- هەندێك لە نووسەران تەنیا لـە خـەمی ئـەوەدان کـە ناویـان وەکو نووسەر بێتە نێوانەوە.

٤- حاڵی رەخنە و بزووتنەوەی رەخنەیمان لە نزمترین ئاستدایە.

٥- حاڵی خوێندنەوەو بازاڕی کتێب زۆر سست و لاوازە.

**پەراوێز:**

لەم کورتیلە چیرۆکەدا نووسەر رەخنە لە عەقڵی دۆگمـای هەنـدێك لە دکتـۆر و مامۆسـتای زانکـۆ دەگرێـت.. بـاس لـەوە دەکـات کـە خوێندکارێکی زانکۆیی، کە دەستی نووسینی هەیـە، لـە گۆڤارێکـدا بابەتێکی بڵاوبووەتەوە. بـۆ هەڵسـەنگاندنی بابەتەکـە، دەیباتـە لای مامۆسـتایەکی خـۆی لەبـەر ئـەوەی لـە پەراوێزەکانـدا نـاوی ئـەم مامۆستایە لەدوای نـاوی مامۆسـتایەکیترەوە هـاتووە خوێندکارەکـە رووشکێن دەکات و بابەتەکەش بە خراپ دەداتە قەڵەم.

ئێمە وایدەبینین کە نووسەر لە خستنەڕووی ئەم بابەتەدا زیادەڕەوی کردووە، چونکە نووسین و ریزبەندکردنی پەراوێزی نووسـین، پەیوەنـدی بە ناوەرۆك و پێکهاتەی نووسینەوە هەیە. بۆیە هـیچ کەسـێك مـافی ئەوەی نییە کە سکاڵا لە پاش و پێشکردنی ناودا بکات.

ئەگەر هەموو نووسەر، یان خوێنەرێك ئەم راستییە نـەزانن، ئـەوا دکتۆر و مامۆسـتایانی زانکـۆ لەهـەر کەسـێك باشـتر ئاشـنای ئـەم راستییەن، چونکە ئەم مەسەلەیە بەشێکە لە بنـەماکانی توێژینـەوەی زانستی، ئەمەش نـەك بـۆ دکتـۆر و مامۆسـتا، بـەڵکو بـۆ هـەموو خوێنـدکارێکی زانکـۆیی وانەیـەکی سـەرەکییە و لـە زانکـۆدا دەخوێنرێت.

نووسەر جگە لەمە، لە کورتیلە چیرۆکی (نووسەر)یشدا گرنگی بە مەسەلەی پاش و پێشخستنی ناو و کەس داوە، ئێمە وایدەبینین لەمەشیاندا زۆر سەرکەوتوو نەبووە.

**رەش و سپی:**

نووسەر لەم کورتیلە چیرۆکەدا رەخنە لە هەڵوێستی دووفاقی هەندێك لە نووسەران دەگرێت، کە چۆن بە خۆڕایی و بەبێ لەبەرچاو گرتنی هیچ بنەمایەکی زانستی، هاوڕێ نووسەرەکانیان دادەشۆرن. باس لەوە دەکات، کە نووسەرێك هاوڕێ نووسەرەکەی بە نەخوێندەوار و بێتوانا دەداتە قەڵەم، بەوەی کە ئەم نووسەری راستەقینەی بەرهەمەکانی ئەوە. لەم کاتەدا هاوڕێ نووسەرەکەی پەیدا دەبێت. کاکی دووڕوو یەکسەر سەرزەنشتەکانی دەگۆڕێت بە ستایش و پیاهەڵدان.

لە کورتیلە چیرۆکی (نهێنی) و (حەربا)شدا (سابیر رەشید) هەمان بابەت بەرجەستە دەکات.

لە کورتیلە چیرۆکی (رەش و سپی)دا بابەتیانە مەسەلەی هەڵوێستی دووفاقی هەندێك لە نووسەرانی بەرجەستە کردووە، بەڵام لە دەربڕیندا تووشی هەڵەی زمانەوانی بووە. نووسەر لەدەمی

پاڵەوانەکەوە دەڵێت: (ئەم کتێب و نووسینانەش هەمووی من بۆی دەنووسم و بەهۆی منەوە ناوبانگی زڕاوە..).

نووسەر نەدەبوو بنووسێت (ناوبانگی زڕاوە) چونکە ناوبانگ زڕاندن کارێکی خراپ و نەشیاوە، کەسێك نییە شانازی بە ناوبانگ و زڕاندنەوە بکات. بۆیە دەبوو بنووسرێت (ناوبانگی دەرکردووە).

## چەقۆ:

نووسەر لەم کورتیلە چیرۆکەدا زۆر بە جوانی توانیوویەتی رەخنە لە زمانی پیسی هەندێك لە نووسەران و هونەرمەندان بگرێت، کە چەند بە شێوەیەکی ناشارستانییانە قسە لەگەڵ یەکدا دەکەن. ئەوانە لەجیاتی ئەوەی لەسەر مەسەلە ئەدەبی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەکان بە زمانێکی سەردەمیانە دایەلۆگ لەگەڵ یکدا بکەن، بە زمانی چەقۆ یەکدی دەدوێنن.

## سەفەر:

لە کورتیلە چیرۆکی (سەفەر)دا ئەو رۆژانەمان بۆ یاداشت دەکات، کە زۆرێك لە خەڵکی، لەناویاندا هەندێك لە نووسەران وڵاتیان بەجێهێشت و بە ئومێد خۆ رزگارکردن، کۆچیان کرد بۆ هەندەران.

نووسەر بە رستەیەکی جوان و پڕ مانا کورتیلە چیرۆکەکەی قفڵ دەکات و دەڵێت: (رۆیشت و لێرە ئازاد بوو، بەڵام لەوێ بەندبوو). سابیر رەشید لەم کورتیلە چیرۆکەدا زۆر بابەتیانە قسە لەسەر چەمکەکانی (ئومێد و بێئومێدی، ئازادی و بەندی و نامۆیی) دەکات. بەڕای ئێمە (سەفەر) جوانترین و پڕ هونەرترین کورتیلە چیرۆکی ئەم کۆمەڵەیەیە.

## گەمەی نوێخوازی:

سابیر رەشید، لەم کورتیلە چیرۆکەدا و لە کەشێکی فەنتازیدا نووسەران دابەشی سێ گرووپ دەکات کە هەر یەکەیان خۆی لەوی دی بە نوێخوازتر دەداتە قەڵەم، شوێنی رووداوی ئەم کورتیلە چیرۆکە چایخانەی (مەچکۆ)یە، کە دیارترین هەوارگەی نووسەران و ئەدیبانی شاری هەولێرە.

لە کۆتایی چیرۆکەکەدا قەڵەمەکەی (رۆلان بارت) دیارترین رابەری بزوتنەوەی نوێخوازی دەبێتە سەنگی مەحەك و کێشەی ئەو سێ گرووپە بەشەڕ هاتووەی ناو چایخانەی (مەچکۆ) یەك لایی دەکاتەوە.

بە مانایەکی دی، نووسەر دەیەوێت بڵێت: لە ئەمڕۆدا هەر کەسێك توانی قەڵەمێك و سەرێك و بیرکردنەوەیەکی وەك (رۆلان بارت)ی هەبێت لە هەر کەسێك زیاتر نوێخوازە.

**ناوبراوی ناو نەبراو:**

یـەکێك لـە دیـاردە نائاسـاییەکانی دنیـای ئـەدەبی و رۆشـنبیری ئـەمڕۆی کـوردی ئەوەیـە کـە هەنـدێك لـە نووسـەران، نووسـەری هەمەچەشن و هەمە پایەن، ئەمانە زیاتر لە عەتار و دووکاندار دەچن وەك لــە نووســەر، چــونکە هــەموو بابــەتێك لــە هەگبەیانــدا دەستدەکەوێت.

ئەم بەناو نووسەرانە لە هیچ بوارێکدا نەیانتوانیووە داهێنان بکەن، رۆژانــە هەوڵــدەدەن کـە بـەهۆی بڵاوکردنـەوەی بابەتـە هەمەچەشـنە بێپێزەکانیانەوە خۆیان بە داهێنەری هەموو بوارێك بناسێنین. ئەمانـە کە هیچیان لە هەگبـەدا نییـە، وادەزانـن بـەحری علـومن و هـەموو شتێك دەزانن، بەڵام لە راستیدا جگـە لـە سـادەگۆیی و جووینـەوەی شتی ئەم و ئەو هیچیتر نالێین.

نووسەر لە رێگەی ئەم کورتیلە چیرۆکەوە، ئەم دیاردە نائاسـاییەی ئەمڕۆی رۆشنبیری کوردیمان بۆ بەرجەسـتە دەکـات و بـە شـێوەیەکی تەنزئامێز، چیرۆکی گرنگی ئەم جۆرە نووسەرانە دەخاتەڕوو.

**منی نادکتۆر:**

نووسەر لەم کورتیلـە چـیرۆکەدا راسـتەوخۆ سەرزەنشـتی ئاسـتی هۆشیاری و شارەزایی هەندێك لـە دکتۆرەکـانی زانکـۆ دەکـات، کـە چەند لە ئاستێکی نزم و کۆنـدان. بـەڕای ئێمـە نووسـەر نـەیتوانیووە بەشێوەیەکی بابەتیانە بەراورد لە نێوان ئاستی هۆشیاری دکتۆرەکان و باسە فیکری و فەلسەفییە هاوچـەرخ و نوێییەکانـدا بکـات، چـونکە مەرج نییە ئەوەی شارەزایی لـە تێـزە فکرییـەکانی (هـانتینگتۆن) و (فۆکۆیاما) نەبێت ئیدی ئاستی هۆشیاری نزم بێت.

**مەچکۆ:**

چاکتر دەبوو ئەگەر ناوی ئەم کورتیلە چیرۆکە (رەخنە) بووایە، نەك (مەچکۆ). نووسەر لەم دەروازەیەوە، حاڵی بێحاڵی ئێستای رەخنـە و رەخنـەگرەکانمان بـۆ دەخاتـەڕوو. سەرزەنشـتیان دەکـات، کـە چـۆن لـەجیاتی دایـەلۆگ و راگۆڕینـەوە، زۆرێـك لـە بـەناو رەخنـەگرەکان دەستیان داوەتە یەخەی یەکتری و شەڕ لەگەڵ یەکدیدا دەکەن. نووسەر لەم کورتیلە چیرۆکەدا فەنتازیایەکی جوانی دروستکردووە، کە چۆن لە ئـەنجامی شـەڕی دوو رەخنـەگردا کتێبخانەکـەی چـایخانەی مەچـکۆ دەسووتێت. ئەوەی لە نێوان پـەڕە سووتاوەکاندا دەمێنێتـەوە، پیتـە جیاجیاکانی وشەی (رەخنە)یە.

بە لایەکی دی لەم کورتیلە چیرۆکەدا خـودی (رەخنـە) رەخنـە لـە هەڵوێستی ئەو بەناو رەخنەگرانە دەگرێت، کە لە مانای راسـتەقینەی رەخنە نەگەیشتوون.

**مەیخانە:**

نووسەر رەخنە لە رەفتاری هەندێك لەو نووسەرانە دەگرێت، کە لـە رادەبەدەر ئالوودەی مەستی و بادەنۆشین. ئەمەیان رەخنەیەکی بابەتی و دروستە، بەڵام لەم کورتیلە چیرۆکەدا زیادەڕەوی لە خستنەڕووی ئەم مەسەلەیەدا کردووە.

ئێمە دەزانین زۆرێك لە نووسەران کاتێکی زۆری خۆیـان لـە بـاڕ و مەیخانەکانـدا بەسـەردەبەن، بـەڵام بـڕوا ناکرێـت نووسـەرێك هـەبێت ئەوەندە گۆشەگیری مەیخانەبێت کە منداڵەکانی نەیناسـنەوەو نـەزانن رەنگ و رووی باوکیان چۆنە!.

(خەندە) لە دایکی دەپرسـێت: (دایـە گیـان بـاوکی ئێمـە چـۆنە، تووڕەیە، یان دڵخۆش، قەڵەوە یانیش لاوازە..!؟).

**جۆکەر:**

(جۆکەر) ئـەو کورتیلـە چیرۆکەیە کـە حەقیقـەتی هەنـدێك لـەو نووسەرانەی، کە هیچ شتێکیان لەلا شەرم نییە دەخاتەڕوو.

کەم نین ئەو نووسەرانەی کە هـەر دەنووسـن و هـیچ ناخوێننـەوە، ئەگەر وانەبن مەحاڵە فریا بکەون کە بابەت و نووسین بۆ ئـەو هـەموو گۆڤار و رۆژنامەیە بنووسن، ئاخر نووسەر هەیە لـە هـەموو گۆڤـار و رۆژنامەیەك نووسین بڵاودەکاتـەوە؟ لەمـەش ئەسـتەمتر ئەوەیـە، کـە نووسەر هەیە بەناوی خوازراو و بەناوی جیاجیاوە بابـەتی دژ بەیـەك، لە شوێنی دژ بەیەك بڵاودەکاتەوە.

(سابیر رەشید) لە هەرکەسێك باشتر لـە خـودی ئـەم جـۆرە بـەناو نووسەرانە گەیشتووە بۆیە ناوی ئەم جۆرە کەسانەی ناوە (جۆکەر).

## کارگەی شیعر:

کورتیلە چیرۆکی (کارگەی شیعر) ئەو واقیعە تاڵەیە کە رۆژانە لە زۆرێك لە گۆڤار و رۆژنامەکاندا بەرچاو دەکەوێت.

بڵاوکردنەوەی بەرهەم لەسەر بنەمای بەرتیل و هاورێیەتی و.....تاد، پەتایەکی کوشندەی ئەمرۆی دنیای رۆشنبیری کوردییە، ئەوەی مایەی نیگەرانییە ئەوەیە، کە هەموو گۆڤار و رۆژنامەکان ئاڵوودەی ئەم پەتایەن، بۆیە دەتوانین بێ دوودڵی بڵێین: تەواوی گۆڤار و رۆژنامەکانمان نەخۆشن، ئەگەر وابڕوات رۆژێك دادێ ئەم نەخۆشییە مرداریان دەکاتەوە.

## قسەو کردار:

کورتیلە چیرۆکی (قسەو کردار) ئەو ئاوێنەیەیە کە تێیدا رۆژانە ئەو نووسەرە درۆزن و دوو روانە دەبینین.

کەم نین ئەو نووسەرانەی، کە لە چایخانە و شوێنە گشتییەکاندا، رەخنە لە هەڵوێستی حزبەکان دەگرن، بەرپرسە حزبییەکان دادەشۆرن و جنێوبارانیان دەکەن.

کەچی، لە پرسگەی بارەگای ئەو بەرپرسانەدا چەندین سەعات دەمێننەوە بۆ ئەوەی دیدەنی ئەو بەرپرسە بکەن، کە پێشووتر سەرزەنشتیان کردووە، بەکورتی بڵێین: رەخنە و سەرزەنشتی ئەم جۆرە

نووسەرانە لە بەرپرسەکان لە کونفەیەکونێکدا دەگۆڕێت بــە ســتایش و پیاهەڵدان.

نووسەر لەم کورتیلە چیرۆکەشــدا لــە کەشــێکی فــەنتازی جوانــدا ڕەخنە لە هەڵوێستی ئەم جۆرە نووسەرانە دەگرێت، بەڵام من زۆر بــێ ئومێدم، کــە ئــەم جــۆرە هەوڵانــە ببێتــە مایــەی ئــەوەی، کــە ئــەو نووسەرانە واز لە دووڕوویی بهێنن.

* سابیر ڕەشید-نووسەران لە کورتیلە چیرۆکدا، چیرۆکنما، ژمــارە (٢)ی نیسانی ٢٠٠٥.

سەرچاوە: گۆڤاری (هەنار)، ژمارە (٢)ی نۆڤەمبەری ٢٠٠٥

# دەق و رەخنە

## دەق: ١٠ کورتیلە چیرۆك

دەق: سابیر رەشید

**١- سەرنج:**

کەللـە سـەرێك لەسـەر مێزێـك دانـدرابوو.. چـەند خەنجـەرێکی ژەهراوی تێدا چەقێنرابوو.. سەدان دەست تاویان دابووە خەنجەرەکان و پێیان دەرنەدەهات.

تێبینی: دەشێ ئەم کورتیلە چیرۆکە بکرێت بە تابلۆ.

**٢- ئێرەو ئەوێ:**

قاچەکانم لێرەن.. سەریشم لە هەنـدەران.. نـە لێـرە دەبمـەوە، نـە لەوێش دەحەسێمەوە.. لەنگەرم نـەماوە.. نـازانم کـەی لـەم خاکـەدا دەڕوێمەوە.. خۆزگە باڵندەیەك دەبووم بێ مەملەکەت.

**٣- چەقۆ:**

نووسەر و هونەرمەندەکانیان تێکرا لە هۆڵێکدا کـۆکردەوە تـا بـە رۆشنبیری خۆیان مشورێك بۆ میللەتە کلۆڵەکەیان بخـۆن.. کەچـی تـا کۆنگرە تەواو بوو زوبانیان هەموو بوو بە چەقۆ و بەخوێنی یەکتر کفت بوون..

٤- بینین:

سەرم لەم میللەتە سوورِماوە وەك شارە مێرووولە بـەرەو هەنـدەران رێچکەیان بەستووە. کەچی شـێخەڵلاکەی مـن جێگـای دەرزی تێـدا نابێتەوە.. خودایە هەر بە زیادیکەیت، بەڵکو شـوێنی کەمبوونـەکان پڕ بێتەوە!!.

٥- سەفەر:

کتێبەکانی خۆی هەموو هەرزان فرۆش کرد.. ناو ماڵەکـەی خـۆی هـەموو هـەراج کـرد.. ئـەوەی هـەیبوو کـردی بـە دۆلار و بـەدوای قاچاغچییەکدا دەگەڕا تا بە گەرەنتی بێ فیزەو پاسەپۆرت بیگەیەنێتە کۆشـکی ئـارەزوو.. منداڵەکانیشـی لێـرە لـە خوانـەی مـاڵی بـاوان چاوەڕێی گەڕانەوەی بن.. تا ئەوانیش لەم فێردەوسـە بێبـەش نـەبن..! ڕۆیشت و لێرە ئازاد بوو، بەڵام لەوێدا بەند بوو..!.

٦- خۆزیا:

ئەوەتانی دوور بە دوور چاوەکانم هەتــەر دەکــەن.. جــاران گونــدی ئێمە بوو، باب و باپیرانمان لەوێ گــەورە بــوون.. ئێســتا خــەڵکانێکی غەوارەی لێیە...

ناشوێرم لەمە زیاتر برۆم و بچمە ئاوایی و سەردانێکی گۆڕی باوکم بکــەم.. و لێــرەوە چــاوەکانم دەکــەم بــە دووربــین و تێــر بــە خــەیاڵ تێیدەڕوانم.. لێرەوە بۆنی ئەم خاکە دەکەم.. لێرەوە بەم خەیاڵە خۆشــە دەست لە کێلەکانی گۆڕســتان و بەتایبــەتیش هــی بــاوکی ڕەحمــەتیم وەردێنم.. تێــر لــە ئاســمان رادەمینــێم، بــەڵکو ئــێ ئەمــە خوایــە و دەمکات بە کۆترێکی گوندەکــەی خــۆم و تێــر تێــر بەســەر ئاواییــدا دەسوڕێمەوەو تێنوویەتیم بە ئاوی بیرەکەی کۆنە هەوارم دەشکێت..

### ٧- کێشمەکێش:

ئەوە خۆمم بەدوای سەرابی خۆم کەوتووم و ســێبەرەکەم هەمیشــە وەك مۆتەکە بەدوامەوەیە.. هەندێکجاران من پێش ئەو دەکەوم و ئەو راوم دەنێــت.. گــەلێکجاریش ئــەو لــەپێش منــە و مــن شــوێنی پێیهەڵــدەگرم.. گــرنگ ئەوەیــە هــەردووکمان بــەدوای دەرفەتێکــدا دەگەڕێین تا یەکتری غافڵکوژ بکەین.. خوایە هەردووکمان لێکتر نزیك نەکەیتەوە چونکە لە هەردوو حاڵەتدا هەر خۆم دەسڕێمەوە!!.

٨- بزربوون:

تازە خەریك بوو خۆم دەدۆزیەوە.. تازە وەڵامی پرسیارەکانی خۆم پێدەدرایەوە.. تازە هەنگاوەکانم گورج دەبوون.. بەڵام کە گەیشتمە ناو حەشامەتەکەی شێخەڵڵا زوو هەڵیان لووشیم و رفاندمیان.. ئێستا خۆشم لە چارەنووسی خۆم ناگەم و خۆشم نازانم چۆن دزراوم و لە کوێندەرم!!.

٩- پرسیار:

دوای گفتوگۆیەکی دوورودرێژ پێموت (دەبێ ئەو خەڵکەی ئێمە لە دوورگەی "گوام"دا ولاتێك دروست نەکەن!؟).

ئەویش وەڵامی دامەوەو وتی (ئەی بۆچی لە ئەڵمانیادا نەبێت!؟).

برادەرێکیتر لەملاوە ئاگای لە گفتوگۆیەکە بوو بەجۆرە کۆتایی بە دەمەتەقێیەکەمان هێنا.. (بەخوا لەوێش هەموو پێکەوە لە مەملەکەتێکدا کۆبکرێینەوە برا کوڕییەکە بۆ ئەوێ دەگوازرێتەوە!!).

١٠- پێچەوانە:

وادیارە قەت ناگەین بە یەکتر من بە نووکی قەڵەمەکەم و ئەویش بە خەنجەر و شمشێر.. من بە پەیڤین و هزرو رێزلێنان و ئەویش بە جنێو و هەڕەشە و قسەی بە توێکڵ.. وامان لە چارەدا نووسراوە هەر دەبێت بەجۆرەش برای یەك دایك و باوك بین!!.

# ١٠ کورتیله چیرۆك و چەند سەرنجێك

رەخنە: سەلاح عومەر

کورتیله چیرۆك، یان هەر ناوێکی دیکە کە لێیدەنرێت، لەمێژ نییە چیرۆکنووسانی کوردی بەخۆیەوە خەریك کردووە، ئەوەنـدەش کـە لـەم تەرزە چیرۆکە گرینگ بێ پێناسە کردن و ناونانی نییە بە قەد ئـەوەی تـا چـەند دەتـوانێ وەك ژانرەکـانیتری ئـەدەب تێنوویـەتی خوێنـەر بشکێنێ و تا چەند دەتوانێ هەق بداتە بابەتێ، کـە چـیرۆکنووس بـۆ تەرحکردن هەڵیدەبژێرێ.ئەو شێوازە هونەریەش کە بابەتەکە دەکا بـە ناوەرۆك و پۆشاك، چ جوانیەك بە کورتیلە چـیرۆکەکە دەبەخشـێ، تـا چەندیش لە توانای نووسەرەکەیدا هەیـە مێشـك و دەروونـی خوێنـەر بورووژێنێ و تووشی سەرسوورمان و رامانی بکات.. تا چـەندیش لـە توانای چیرۆکنووسەکە هەیە پرسیار لە مێشکی خوێنـەر بخـولقێنێ و مەودای بیرکردنەوەکانی بەرفراوان بکات.

پێموایە نە چیرۆك دەبێ بە كورتیلە چیرۆك و نە شیعریش بە چیرۆك، كورتیلە چیرۆكیش جێی هیچ كامێك لەمانە ناگرێتەوە، بەڵام هێندە هەیە. ئەم تەرزە نووسینە پتر لە شیعرەوە نزیكە نەك ئەوانەی دیكە. لە تابلۆ و كەڤاڵەوە نزیكە نەك وێنەی فۆتۆگرافی.

لە شیعرەوە نزیكە بەوەی كە بە زمانێكی ئیمائی چڕوپڕ دەنووسرێت و لە هونەری شێوەكاریش نزیكە بەوەی كە ڕەنگ و هێڵ و دوورییەكانی تابلۆ دەگرێتەوە خۆ و بۆی هەیە ببێ بە تابلۆ.

وشەكانی ئەم تەرزە نووسینە شوێنی ڕەنگ و شتەكانی دیكە دەگرێتەوە. بە كەمترین وشە ناوەرۆكێكی بەرز دەردەبڕێ. ئەگەر هونەریانە بنیاتبنرێ.

ڕەنگە من وەك مرۆڤێك و خوێنەرێك تێنوویەتیم پتر بە ڕۆمانێ، یان چیرۆكێكی درێژ بشكێ لەوەی بە كورتیلە چیرۆكێ. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ، كە ئەم جۆرە نووسینە نییە، یان نابێ هەبێ.

بەڵام ئەگەر چڕوپڕ و زمانەكەی شیعری و ئیمائی بوو، هونەریانە دارێژرا بوو ئەوا ڕەنگە شوێن نەشكانی تێنوویەتی زۆران بگرێتەوە لاریشم لە هەڵبژاردنی هیچ بابەتێ نییە، چونكە پێموایە تەنیا بابەت شت ناكا بە ئەدەب و هونەر ئەگەر شێواز و دەربڕینی لاواز بوو. ئەگەر زمانی تۆكمە نەبوو.. لە ژیانی ڕۆژانەماندا بە دەیەها، یان بە

سەدەها بابەت هەن و دەشێ بکرێن بە بابەتی چیرۆك، یان رۆمان، یان شیعر، یان هەر بەشێکی دیکەی ئەدەب و هونەر.

کەمن ئەوانەی توانیویانە بابەت هەڵبژێردراوەکانیان لە دوو تۆی هونەرێکی بەرز دابرێژن و خوێنەر وا لێبکەن تووشی دەهشەو رامان و بیرکردنەوە بکەن. یان خوێنەر بکەن بە بەشێك لە کرداری نووسینی دەقەکە و تا کاری هەڵوەشانەوەو شیکردنەوەی بینای هونەری و فیکری بخەنە ئەستۆی خۆیان.

دیارە (سابیر رەشید) یەکێکە لەو چیرۆك نووسانەی دەمێکە لە هەوڵداندایە بۆ نووسینی دەقێکی ئەوها. هەندێ هەوڵیشی جوانن و هەندێکیتریش نا. بۆیەش دەڵێم هەوڵدان، چونکە بەبڕوای من ئەدەب خۆی هەوڵدانە بۆ بیرکردنەوەی چاکتر و خەیاڵکردن و خولقاندن، خولقاندنی جیهانێ، کە پێشتر نەبووە، یان هەیە و پێیی ناگەین. وەك فرۆیدیش دەڵێ: ((ئەدەب و هونەر جۆرێکن لە تەنفیس بۆ حەسانەوەو ئارام بوون)).

لەژێر رۆشنایی ئەمانەی سەرەوەدا تیشك دەخەینە یەك بە یەکی ئەم کورتیلە چیرۆکانەی (سابیر رەشید).

## ١- سەرنج:

لە کۆتایی ئەم کورتیلە چیرۆکەدا (سابیر) بینووسیبایە، یان نا ئەم کورتیلە چیرۆکە خۆی تابلۆیەکە و بە وشە ڕۆنراوە. تابلۆیەك کە هونەرمەندێکی خەیاڵ بەرفراوان کێشابێتی.

تابلۆیەك هەر لە یەکەمین سەرنجدانەوە خوێنەر، یان بینەرەکەی تووشی ڕامان و بیرکردنەوە دەکات و ماوەیەك بەدیارییەوە دۆشدا دەمێنێ. چەندین پرسیاریش لە مێشکیدا دەورووژێنێ. ئاخۆ ئەم کەللەسەرەی لەسەر مێزەکە دانراوە هی کێیە، کەللە سەری ڕۆشنبیرێکە، یا خوێنمژێ، یان هەژارێکی بێ دەرەتان. کێن ئەوانەی خەنجەرەکانیان ئاراستەکردووە ئەوانەش کە هەوڵی دەرهێنانی خەنجەرەکان دەدەن کێن.. دواجار بۆ خەنجەرەکان لە کەللە سەرەکە نایێنە دەرەوە، وەك شتێکی بەڵگەنەویست کەللەسەر مەڵبەندێکە بۆ بیرکردنەوەو لای مرۆڤی ڕۆشنبیر و عاقڵمەند.

پتر لە خەڵکی ئاسایی بایەخی هەیە. تۆ بڵێی لێرەدا خەنجەرەکان بۆ ژەهراوی کردنی فیکر و بۆچوونە ڕاستەقینەکانی ڕۆشنبیران ئاراستە نەکرابن. بە هەمان پێوانەش ئەوانەی هەوڵی دەرهێنانیان دەدەن هەمدیسان مرۆڤی ڕۆشنبیرن و مەبەستیانە کەللەسەرەکە لە ژەهراوی بوون ڕزگاری بکەن. خۆ ئەگەر کەللەسەرەکەش هی خوێنمژ و دیکتاتۆرێك بێت ئەوا ئەوانەی خەنجەرە ژەهراوییەکانیان ئاراستە

کردووە زەرەمەند و چەوساوەو زوڵم لێکراوەکانن. ئەوانەیش کە هەوڵی دەرهێنانیان دەدەن ئەوا لە خشتەچووەکانن و موریـدی خوێنمژەکـەن. بەهەر حاڵ ئەم کورتیلە چیرۆکە، کورتیلـە چـیرۆکێکی سـەرکەوتووەو جوان بنیاتنراوە.

**٢- ئێرەو ئەوێ:**

ئەم کورتیلـە چـیرۆکە زۆر راسـتەوخۆ خراوەتـەڕوو. پاڵەوانەکـەی نامۆیە و بەزێدی باو باپیرانی. نامۆبوونیش بە مانای ئەوە نـابێ، کـە مرۆڤ تەنیا ئەگەر لە هەندەران، یان دوور لـە وڵات و ئـازیزانی خـۆی بوو ئەوسا هەست بە نامۆیی بکات. جاری وا هەیە مرۆڤ لەناو ماڵ و منداڵ و وڵاتی خۆشیدا نامۆ دەبێ. لەناو خودی خۆشـیدا هەسـت بـە شتێ دەکات نازانی چییە. مرۆڤ، کە لە واقیع دابـڕاو بیروخـەیاڵی لـە شوێنێکیتر بوو لێکدەترازێ و دەبـێ بـە دوو مرۆڤـی سـەر بـە یـەك جەمسەر. کە لەوێشە هەمان معاناتی هەیە لێرەش ئـۆقرە ناگرێـت و بەدوای ئارامگەیەکی رۆحی دەگەڕێ تێیدا بحەسـێتەوە. لـەناو خـودی خۆشیدا پەرتەوازە بووەو نازانێ بـەرەو کـوێ سـەرهەڵبگرێ. چ لـەوە ناخۆشتر هەیە نەك تاك بە تاکی کۆمەڵ ئـەم ئیحساسـەی لا دروسـت ببێ، بەڵکو گشت کۆمەڵگا ئەم هەستی نامۆبوونە ببێتە وێردی سـەر زمانی و بیرو خەیاڵ و ئەندێشەی تاکەکانی بە دەوریـدا بسـووڕێتەوە،

لە شوێنێکی ئەم کورتیلە چیرۆکە لەسەر زمانی پاڵەوانەکەی واهاتووە و دەڵێ لەنگەرم نەماوە وا جوانتر بوو بڵێ لـە هـیچ شـوێنێ لەنگـەر ناگرم.

### ٣- چەقۆ:

کە رۆشنبیر و هونەرمەندان بوون بە پاشکۆی سیاسەت و حزبـەکان ئەوا بێ شکە هیچ شتێ لەدەست خۆیان نامێنێ و دەبـن بـە ئـامێر و داشـی دامـە و هـەر ئـەوانیش هەڵیاندەسـوورێنن. کوێیـان ویسـت دەیانبەن و لە هەر شوێنێ بیانەوێ کۆیان دەکەنـەوە. هـەر بـە فیتـی ئەوانیش دەکەونە شەڕە چەقۆ و شەڕە قۆچانێ، هونەرمەند و رۆشـنبیر چۆن دەبێ بە خاوەن هەڵوێستی تایبەتی، ئەگەر بیروبۆچوونی تایبەتی خۆی نەبێ، لێرە لەم وڵاتە بریـندارەی ئێمەشـدا، کـە تـا بینـە قاقـا نقوومی ئەزمەی گەورە گەورە هـاتووین، هـیچ شـتێ بـەهاو پـیرۆزی خۆی نەماوەو هیچ ئیعتبارێك بۆ بیروباوەڕی جیاواز نـەکرێت دەنگـی رۆشنبیر و هونەرمەندان بەچی بگات کە خۆیان بەوە رازی بن بـبن بـە پاشکۆ.

٤- بینین:

بابەتی ئەم کورتیلە چیرۆکە نزیکە لە کورتیلە چیرۆکی (ئێرەو ئەویّ) دیارە میللەتیّ بەم چەشنە تووشی ئەزمە هاتبیّ، شتێکی ئاساییە تاکەکانی، یان هاولاّتیانی هەولّی خۆ دەربازکردن بدەن. کاتیّ پالّەوانی ئەم کورتیلە چیرۆکە هەست دەکات، یان دەبینیّ زۆربەی برادەرو خزم و ناسیاوەکانی روو لە هەندەران دەکەن ئەوا دیارە هەروا لە خۆڕا نییە و شتیّ هەیە پالّیان پێوەدەنیّ تا روو لە هەندەران بکەن. پێموایە هۆکەش بۆ روقعەی جوگرافی لە ولاّتەکەمدا ناگەڕێتەوە، بەلّکو ئەنجامی تووشی و ئاژاوەو شەڕو شۆڕ و هەستکردنە بە مردنی بەهایەکی پیرۆز کە پێش ئێستا لە دلّ و دەروونی هەموو کوردێکدا وەك ئەمام سەریدەرهێنا بوو کەچی ئێستا پووکاوەتەوە.

٥- سەفەر:

بەدەیان جار نووسەر و رۆشنبیر لەپێناو بژێوی خۆی و مالّ و مندالّەکانیدا کتێب و ناو مالّی خۆی هەرزان فرۆش کردووە. ئەوەی کە هەشیبووە کردوویەتی بە قوڕگی خۆی و مندالّەکانی، بەلاّم کاتیّ ئەم کارە لەپێناو هەلاّتن و خۆدەربازکرندا بێت پێویستی بە رامان و لەسەر وەستان و بیرکردنەوە هەیە. پێموایە ئەم ئازادی و سەربەستیەی کە پالّەوان لە کۆتایی کورتیلە چیرۆکەکەدا باسی لێوە دەکات ئەو

ئازادییە نییە کە دەبێ هەبێ. هەڵاتنیش هەمیشە بۆ رزگاربوونە لە ئەزمە رۆحی و دەروونییەکان و شتێکی کاتییە و چارەسەر نییە. مەرج نییە ئەوەی گەیشتە هەندەران ئەوا ئیتر فیردەوسی دۆزییەوەو شتێ نەماوە بیری لێبکاتەوە. ئەم کردارەشی تاقیکردنەوەیەکە و مرۆڤ خۆی بەرپرسیارە لە ئەنجامەکەی. کە مرۆڤی بەڕاستی ئازاد بوو ئیتر بۆ بەندایەتی هەڵدەبژێرێ دووبارەبوونەوەی هەمان بابەت لێرەدا نیشانەی نەشکانی تێنوویەتی نووسەرەو هەست دەکات بە تەواوی حەقی بابەتەکەی نەداوە. دەتوانم ئەوەش بڵێم کە رەنگە لەلای زۆربەشماندا ئەوە هەبێ کە ئێمەش وەك ئەو هەموو خەڵکە هەڵاتووە حەز بەوە بکەین کە رۆژێ لە رۆژان لێرە رزگاریمان بێ و روو لە هەندەران بکەین.

### ٦- خۆزیا:

بە درێژایی دەیەها ساڵ کارەسات بەدوای کارەسات بەسەر کورد هاتووە. گوند وێران بووەو گوندنشینەکانی تووشی ئەشکەنجە و ئازار هاتوون و گوندەکانیان خاپوور کراوەو راگوێزراونەتەوەو لە زێدی باو و باپیرانیان دابڕاون. ئەگەر ئەوە حاڵی میللەتێ بووبێ ئاخۆ چ زامێکی قووڵ و چ حەسرەت و سووتانی لەناو هەناوی تاکەکانیدا سەریهەڵداوە. پاڵەوانی ئەم کورتیلە چیرۆکە یەکێکە لەو گوندنشینانەی بە زۆرەملێ

لە گوندەکەی راگوێزراوەتەوەو دەرکراوە. لە شوێنی ئەودا خەڵکانێکی دی هێنراوەتە گوندەکەیان و دەست بەسەر ماڵ و موڵکیدا گیراوە. گرینگ لێرەدا مەودا زەمەنییەکەی نێوان هاتنەوەی و راگوێزانەکە نییە. گرینگیش ئەوە نییە ئاخۆ بە رێکەوت هاتۆتە دیار گوندەکەی، یان بە ئەنقەست رووی لە هەوارێکی نزیك گوندەکە کردووە تا لەوێوە چاو ببڕێتە ناو ئاوایی و حەسرەت بۆ دووربوونەوە لێهەڵبکێشێ.

پاڵەوان لە شوێنیێ گیری خواردووەو بۆی نییە ببزوێ، کە نەتوانێ یەك هەنگاو لەوێ دوورتر بڕوات بە خەیاڵ. دەچێتەوە ناو گوندەکەیان و بەناو ئاواییدا گوزەر دەکات. بە خەیاڵیش دەست لە کێلی گۆڕی باوکی وەردێنێ. خۆزگەش بەوە دەخوازێ کە ببێ بە کۆترێکی ناو گوندەکە، بەڵکو ئێ ئەوە خوایە تێر تێر بەسەر ئاواییەکەیدا دەسووڕێتەوە.

کورتیلە چیرۆکێکی جوانە و زمانەکەی نەختێ چڕەو چیرۆکنووس لە نووسینیدا تارادەیەکی چاك سەرکەوتنی بەدەستهێناوە.

### ٧- کێشمەکێش:

پاڵەوانی ئەم کورتیلە چیرۆکە تووشی دابەشبوون هـاتووەو هەسـت دەکات دوو کەسە. خۆی و سێبەرەکەی، خۆی و سـەرابی خـۆی. ئـەم دابەشبوونەش لە دەروونزانیدا پێیدەڵێن (الانشطار) واتـا هـیچ یـەکێ لەم دوو کەسایەتییە ئاگای لە کارو کـردەوەی ئـەویتر نییـە و رەنگـە یەکێ نەفی ئەوی دی بکاتەوە.

جـار جـارە خـۆی لـە پێشـەوە دایـە و جارجـارەش سـەراب و سێبەرەکەی. ئەم دوو کەسە بەردەوام لە ململانێدان و لە دوژمنایـەتی یەکتر ناکەون. لە دەرفەتێ دەگەڕێن و خۆیان بۆ یەك لە بۆسە ناوە تـا زەبر لە یەك بوەشێنن و یەکتر بکوژن. دیارە ئەمە لـەڕووی سیاسـی و کاری حزبیشەوە مانا هەڵدەگرێ. چیرۆکەکە لەسەر زمـانی یـەکێ لـە کەسـەکان خۆزگەیـەك دەردەبـڕێ کـە بـە نزیکبوونـەوەیان، یـان بـە یەکگەیشتنیان کارەسات دەقەومێ و زەرە دەبینین. بـوونی یـەك وەك بوونی بوونەوەری زیندوو دەسڕنەوە.

پێموایە ئەوە رێك وەك ئەوە وایـە کـە دوولایـەنی شـەڕکەری زۆر لەیەك نزیك و سەر بە میللەتێك وەك میللەتی کورد بکەونە ململانێ و براکوژی، ئەگەر هەر لایەنێك ژێرکەوێ و زیانی پێ بگات میللـەت زەرەر دەکات.

٨- بزربوون:

مرۆڤ تا خۆی دەدۆزێتەوە تووشی گێرمەو کێشەی زۆر دەبێت، لە پێناویشدا دەبێ بارمتە بدات. ئەو وەڵامانەش کە بە دوایاندا وێڵ و سەرگەردان دەبێ هەمدیسان وا بە ئاسانی دەستناکەون جاری وا هەیە سەریشی لە پێناو ئەم خۆدۆزینەوەیەدا تێدەچێ. چ لەوە ناخۆشتر نییە مرۆڤ شەونخوونی و هیلاکی، ئێش و ئازاری زۆر ببینێ، کەچی لەدواجاردا مایە پووچ دەربچێ و لە ماوەی چاونووقانێکدا هەرچی دەستکەوتووە بدرێتە بەر باو گەردەلوول رایماڵێ. ئەمە خۆی لە خۆیدا کارەساتێکە و تەنیا مرۆڤە قوربانی دەرە کە خۆی هەست بە زەرەر و زیانی دەکات و هەر خۆشی زەرەرمەند دەبێ. کە مایەپووچیش دەربچێ ئەوا دەبێ بە تاکێك لەناو مێگەلدا و ون دەبێت و هیچ بەهایەکی نامێنێ. پاڵەوانی ئەم کورتیلە چیرۆکەش، پاش ماندووبوون و هیلاکییەکی زۆر پاش قوربانیدان لە پێناوی وەدەستهێنانی ئامانجێکی پیرۆز مایەپووچ دەردەچێ. ئەوەی قوربانی لەپێناودا داوە بۆتە شتێکی بێ بەهاو هیچ ئیعتبارێك بۆ هەوڵدان و کۆشش و ماندووبوونەکەی دانەنراوە، ئەو دەستکەوتە ئاواتەخواز بوو بێتەدەست ئەوا ئێستا لەبەر چاوی زیندەبەچاڵ دەکرێت و خۆشی دەبێ بە سفرێکی پاش ژمارە، دەبێ بە بەرخێکی بەستەزمان و لەناو مێگەلدا بزر دەبێ. پێموایە دەشزانێ بۆ و لەبەرچی بۆتە بەرخێکی بەستەزمان.

دەشزانێ چۆن دزراوەو لە کوێیە. ئەم کورتیلـە چـیرۆکە لـە کۆتاییـدا نەختێ دژایەتی لەگەڵ فیکرەی، یان سەرەتای بابەتەکـە تێکـەوتووە، چونکە مرۆڤ دەزانێ ئەگەر یەکێکی دیـی رەنـج و مانـدووبوونی ئـەو بدزێ دەزانێ کێیە و چۆنیش دەیـدزێ. بەتایبـەتی ئەگـەر مرۆڤێکـی خاوەن مەسـەلەیەکی گـەورە بێـت وەك نیشـتمان و میللـەت. بۆیـە پێموایە ورووژانـدنی پرسـیارێکی ئـەوها خوێنـەر لـە ئیقنـاع کـردن دووردەخاتەوە.

## ٩- پرسیار:

ناوەڕۆکی ئەم کورتیلە چیرۆکەش هەمدیسان نزیکە لـە نـاوەڕۆکی کورتیلە چیرۆکی کێشمە کێش. (سابیر) دەیتوانی ئەم دووانە بکات بە یەك چیرۆکێکی چڕتر و هونەریتری لێ بەرهـەم بێنـێ، بـەلاّم ئەوەنـدە هەیە لە کێشمەکێشدا براکوژیەکە لەناو خـاکی ولاّتدایـە. کەچـی لـە پرسیاردا کەوتۆتە هەندەران. لێرەدا چیرۆکنووس پێیوایە کورد بۆ هەر کوێ بچێ براکوژییەکە بۆ ئەوێ دەگوازێتەوە کە ئەوە حاڵی میللـەتێ بێ ئاخۆ چارەنووس و ئایندەی بەچی دەگات. کەواتە چارە لە کوێیە و تاکەی ئەمە حاڵمان دەبێ.

زمانی ئـەم کورتیلـە چـیرۆکە نـەختی وتارئـامێزە. دەکـرا چـڕتر بکرێتەوە.

١٠- پێچەوانە:

قەڵەم و چەك دوو ئامرازی دژ بەیەكن. یەكیان بنیاتنەر و ئەویدی رووخێنەرە ئەم دووانەش هەمیشە و بەردەوام لە ململانێدان. لە وەتەی مرۆڤایەتیش، یان مرۆڤ خولقاوەو هەستی بە بوونی خۆی كردووەو قەڵەمی گرتۆتە دەست هەستی بە بایەخی قەڵەم و خۆ رۆشنبیركردن كردووە. چەك و چەك بەدەستان ویستویانە خاوەن قەڵەم لەناوبەرن و دەمكوتی كەن. چەك هێزێكی رووخێنەرەو هەرچی بەهای جوان و هزری جوان و خەیاڵی جوان هەیە دوژمنیەتی و پێی قەڵس دەبێ. بۆیە بەردەوام چەك هەوڵی ئەوە دەدا كۆت و پێوەندی بخاتە مەچەكی قەڵەم. خاوەن قەڵەمیش بەدرێژایی مێژوو بەرەنگاری چەك و چەك بەدەستان بۆتەوەو لە ئەنجامدا تووشی ئازار و راوەدونان و گرتن و لەناوبردن هاتووە، بەڵام نەیتوانیووە قەڵەم دەستەمۆ بكات. هەتا ئەگەر قەڵەم بەدەست و چەك هەڵگرەكە برای یەك دایك و باوك و لە منداڵدانی یەك خاك و وڵاتیشدا خولقابن.

سەرچاوە: گۆڤاری (كاروان)، ژمارە (١٢٣) ساڵی ٢٠٠٥.

## (ئاوێنە)کەی سابیر رەشید چیمان پیشان دەدات؟

**ئەسعەد عەزیز**

کتێبی ئاوێنە لە زنجیرە کتێبە چاپکراوەکانی کتێب فرۆشی سۆران لە هەولێر کە ژمارە (٥٥) لەو زنجیرەیە وەرگرتووە، هەروەکو لە بەرگەکە ئاماژەی پێدراوە (١٠٠) کورتیلە چیرۆکە لەلایەن چیرۆکنووس (سابیر رەشید)ەوە نووسراوە.

هەموو چیرۆکەکانی دووتوێی ئەم کتێبە لەو جۆرە چیرۆکانەیە کە پێیدەوترێت "چیرۆکی زۆر کورت"، یان وەکو نووسەر ناوی ناوە "کورتیلە چیرۆك".

لەسەرەتادا دەمەوێت دەستخۆشی لە برای نووسەر بکەم، چونکە خۆی لە قەرەی ئەم شێوازە نووسینەداوە لەبەر ئەوەی هەوڵێکی نوێگەرییە لە بواری چیرۆکنووسیندا، راستە یەکەم هەنگاوی چیرۆکی

کــوردی نییــە لــەم ڕووەوە، چــونکە هــەروەکو نووســەر لــە پێشــەکی کتێبەکەی ئاماژەی پێکردووە.

سەرەتا نووسینی بۆ ساڵانی حەفتاکان دەگەڕێتــەوە، بــەڵام لەگــەڵ ئەوەشدا ئەم جۆرە چیرۆکە، چیرۆکنووسی کوردی کەمتر کــاری لەســەر کردووە و لە بواری نووسین سازی کوردیدا کەمتر بەکاری هێناوە.

نووسەر (٢٠) چیرۆکی سەرەتای کتێبەکەی بە ئاوێنــە نــاوبردووەو (٨٠) چیرۆکەکەیتریشی ناوی جۆراوجۆری بۆ هەڵبژاردووە.

کورتیلە چــیرۆك لــەناو ئــەدەبی جیهانیــدا بەشــێوەییەکی بەرچــاو بڵاوبووەتەوە، بیروبۆچوونی لەبارەوە جیاوازە کە هەندێك لەو بیروڕایانە پشتگیری ئەم تەرزە چیرۆکانە دەکــەن و هەنــدێکیتر ڕەتــی دەکەنــەوە ئەوانەی کە ئەم شێوازە نووسینەیان بەلاوە پەســەندە لەگــەڵ ئەوەشــدا نکۆڵی لەوە ناکەن کە ئەم نووسینانە گرانترین شێوازی نووسینە لەبــەر ئەوەی نووسەر لە چــەند ڕســتەیەکدا هــەموو بنــەما ســەرەکییەکانی چیرۆك تەوزیف دەکــات، ئــەوەی لــە چــیرۆکێکی ئاســایی بەرجەســتە دەکرێت لە تــەکنیك و گێڕانــەوەو زمــان و بــیر پێویســتە لــەم جــۆرە چیرۆکەش فەراهەم بکرێت، بەڵام سەرەڕای ئەمانە، لەم جۆرە چــیرۆکە دەبێت پەیوەندییەکی بەهێزی بە واقیعەوە هەبێت کە لە چیرۆکیتر ئەو پەیوەندییــە نابێتــە پێویســتی کــە وەکــو لێــرەدا دەبێتــە زەروورەت، هەروەها لەپاش خوێندنــەوەی ئــەم چــیرۆکانە دەبێــت شــتێك لــەبیری

خوێنەردا بەجێبهێڵێت، ئەگەر بەراوردێك لە نێوان ئەم شێوە چیرۆکە بکەین لەگەڵ کاریکاتێر دەبینین خاڵی هاوبەش لە نێوان ئەو دووانە زۆرە، بەڵام پێکهاتەی هەرەیەکە لەوانە جیاوازترە لەویتر.

"ئاوێنە" کە توانیوویەتی بنەمای چیرۆکی زۆر کورت هەڵبگرێت و گوزارشت لە واقیعی کۆمەڵگە بکات و دەربڕینێکی راستگۆیانەی نووسەرە لەسەر ئەو بابەتانەی کە بووەتە ناوەڕۆکی چیرۆکەکانی نووسەری ئاوێنە لە دوو توێی ئەم کتێبە گوزارشت لە چەمکێکی گرنگ دەکات ئەویش پەیوەندی نووسەرە بە کۆمەڵگەکەیەوە، کە ئەم پەیوەندییە ئەو هێڵە فکرییەیە کە هەر لە سەرەتای چیرۆکەکانییەوە درێژبووەتەوە بۆ کۆتایی ئەم کۆمەڵە چیرۆکە، بە تەنیا پەیوەندی خودی نووسەر نییە، بەڵکو پەیوەندی کەسی رۆشنبیر و بەهرەمەند و نووسەرە بە کۆمەڵگە و دەسەڵاتەکەیەوە وەکو لەم چیرۆکانە دەردەکەوێت:

"ئاوێنە (١٤)، ئاوێنە (١٧) گەشتێکی خەیاڵی، باڵندە، چیرۆك، نەکتەر، پەراوێز، نامیلکە، نووسەر، ناوبراوی ناونەبراو، جۆکەر، جەژنی بڵاوکردنەوە".

بەڵام ئەو پەیوەندییە نەگەتیڤە، چونکە نووسەر مامەڵەیەکی رەخنەگرانە و بەدیدی واقیع بینییەوە دەڕوانێتە دەورووپشتی و هەندێجار رەخنەکانی ئاڕاستەی خودی نووسەرەکانیش دەکات و

بەرپرسیاریان دەكات لە دروست بوونی زۆر دیاردەی ناشارستانییەتی لەنێو ئەم توێژە گرنگەی كۆمەڵی كوردەواری.

لە دوای خوێندنەوەی ئاوێنە گەیشتمە ئەو بڕوایە كە پێویستە زۆر چیرۆكنووسی تر ڕێچكەی ئەم ڕێگایە بگرنەبەر و كار لەسەر ئەم تەرزە چیرۆكانە بكەن، چونكە هێشتا ئەم جۆرە نووسینە لەنێو ئەدەبی كوردیدا بە كەمی دەبینرێت.

ئەم چیرۆكانەی ناو كتێبی ئاوێنە كە لە خوارەوە ناویم هێناوە چەندەها پرسیار لەبیری خوێنەردا دەورووژێنێت و گەمەیەكی بەردەوامی وشە دەبێت لەسەر لێوی بیركردنەوەی خوێنەردا بۆ دروستبوونی خەندە و پێكەنینی بیركردنەوەی خوێنەر.

"پێناساندن، ٨٤ پرسیار، ڕێگا، پەنجەرە، مەملەكەتی، باڵندە، تەلیسم، شەمەندەفەر، ئاوێنە ١٩، ئاوێنە ٩، ئاوێنە ٣".

لە كۆتاییدا دەڵێم نووسەری ئاوێنە هەوڵیداوە بەكارهێنانی ئەم جۆرە نووسینە نوێیە دەرگای ئەم چیرۆكە لەنێو ئەدەبی كوردی بكاتەوە.

سەرچاوە: ڕۆژنامەی (هەواڵ)، ژمارە (١٨٠) ساڵی پێنجەم، ١٣ی ئایاری ٢٠٠٦.

# ئاوێنە: ١٠٠ کورتیلە چیرۆکی سابیر رەشید

مەسعوود پەرێشان

ئـەدەبی کـوردی لـە دنیـای چـیرۆکدا بەگشـتی و لـە کورتیلـە چیرۆکیشدا بەتایبەتی. هەژار و دەستکورتە و لـە دنیـای رۆمانیشـدا وەکو تازە پیرۆکەیەك لە هەنگاوی کیسەڵ ئاسادایین تـا ئـەو ئاسـتەی هەیە دەڵێ هەمانە و هەشە دەڵێ نیمانە.

لە بـواری شـیعر و شـاعیریەتیدا، تـاکی کـورد زۆر بـە زەحمـەت دەتوانێ بوونی خۆی بسەلمێنێ و بشبێتە نـاوێکی دیـار و ناسـراو کـە ئەمەیان بۆ چیرۆك و رۆمان و هاوشێوەکانیان پێچـەوانە دەکەوێتـەوە، بەوەی تا ئێستاش ئەو رایە باوە لە ئارادایە کە دەڵێ: کورد هـەمووی شاعیرن، بەڵام چیرۆکنووسمان دەگمەنن و ئەوەی ئـەو بـوارە هەڵبـژێرێ زووتر دەردەکەوێ و چێتریش دەناسرێ.

سابیر بە هـەوڵ و کۆششـی بـەردەوامی خـۆی و خوێندنەوەیـەکی وردبینانەی خۆیەوە، تـوانی لـە دنیـای چیرۆك و کورتیلـە چـیرۆك و ناساندنی و رانانی رۆمان و رەخنـەی ئـەم بوارانـەش ببێتـە نـاوێکی ناسراو و تا رۆژی ئەمڕۆش ئەو تایبەتمەندییە دەگمەنەی خۆی بپارێزێ و لەو پێناوەشدا چەند کتێبێـك چـاپ بکـات و کۆمـەڵێك چـیرۆك و لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆریش لە رۆژنامـە و گۆڤارەکانـدا بڵاوبکاتـەوە. دوا بەرهەمی ئەو چیرۆکنووسە بریتییە لە چـاپکردنی سـەد کورتیلـە چیرۆکی خـۆی، لـە دوو تـوێی دیوانـە چـیرۆکێکی بچـووکدا بـەناوی (ئاوێنە). ئەم کتێبە کە لە بەرگێکی تۆزێك لە مامناوەندی بچـووکتر کەوتۆتە بەردەستمان بەرگەکەی بریتییـە لـە تابلۆیـەکی هونەرمەنـد (نامیق عەلی قادر) و لە هەشتا لاپـەڕە بەرجەسـتە بـووە و لەلایـەن کتێبفرۆشی سۆرانەوە چاپ و وەشان کراوە.

بەرایی ئەم کورتیلە چیرۆکانە بریتییە لە بیست ناونیشان بە نـاوی (ئاوێنـە) کـە هـەر ئاوێنەیـەك رەنگدانـەوەی هـزری نووسـەرەکەی پێشـاندەدات بەرانبـەر بـە ژیـان و گۆڕانکارییـەکانی، بەرانبـەر بـە جیاوازییەکانی دیدو بۆچوون و بینینەکان، بـریتین لـە دیـدی نووسـەر بەرانبەر کۆمەڵ و دەوروبەر و سیاسەت و تـاکو کۆیـەکان و دوێنـێ و ئێستا و ئاینده و سەرجەم گۆڕانکارییەکانی ژیانی خۆمان وەکو خـود و کۆمەڵیش لە کۆمەڵگای خۆمان و هەر هەموو دنیا و کەونیش.

که ئەم وەسف و ناساندنە بەسەر هەر هەشتا ناونیشانەکانی دیکەی کورتیلە چیرۆکەکانی دیکەشدا دابەش دەبن بەجۆرێك دەکرێت بڵێین (سابیر رەشید) لە هەر کورتیلە چیرۆکێکدا، چیرۆکێکی زۆر درێژی بچووك کردۆتەوە تا ئاستی برووسکە و ئیمێلێکی نێو دنیای بچووککراوەی جیهانگەرایی ئەمڕۆکەماندا، کە ئەمەیان چەمکێکی تازەگەرییە و تائێستاش گۆڕانکاری بەسەر شێواز و جۆری نووسین و دەربڕینیشدا دێت و لەنێو ئێمەدا تا ئێستا سنووری چاولێکەری نەبەزاندووە، بەڵام بەڕاستی (سابیر رەشید) لەم دیوانە چیرۆکە کورتانەیدا ئەم سنوورەی بەزاندووە و توانیویەتی وەکو بیرکردنەوەو چۆنییەتی کورتکردنەوەی هزرەکان و داڕشتن و فۆرم و باکگراوندیش بیانکوردێنێ تا ئەو ئاستەی باوەڕ بەوە بکەین، کە لەنێو جیهانی تازەگەری چیرۆکی کوردیماندا، کورتیلە چیرۆکیشمان هەیە.

ئەمە لە خۆڕا دروست نەبووە، چونکە هەر دەکرێ لەم یەك دوو دێڕەدا ئەو نهێنییەتان بۆ ئاشکرا بکەم، کە (سابیر رەشید) هەر لە تەمەنی هەرزەکارییەوە تا ئەمڕۆ، کە ئەویندارێکی بە تاسەی کتێب بووە، تا ئەو ئاستەی لەبەر خاتری سەرکۆی بەرهەمەکانی دۆستۆیفسکی چووینە شاری کەرکووك و لەوێ کڕیمان و دواتریش لەبەر خاتری کتێبی وەرگێڕدراوی سەد هۆنراوەی هاوچەرخی ئینگلیزی چووینە بەغدا و دوای کڕین و خوێندنەوەشی، لەوە

گەیشتین کە ئەو بەرهەمە دەگمەنە نییە و بەڕاستیش ئەو سەفەرەی لێ خەسار بوو. بەکورتی و بە کوردی من و (سابیر) هەمیشە تەواوکەری یەکدی بووینە و ماوەیەکیش لە خۆراو لە راهی خواو ناحەزان لە یەك تۆراین، بەڵام زۆر بەڕاستگۆیی ئەو رایە دەردەبڕم، کە (سابیر رەشید) خۆی خۆی پێگەیاند و کاردانەوەی هیچ کەسێکی بەسەرەوە نییە، هەتا خودی خانەوادەکەشی کە رەنگە تا رۆژی ئەمڕۆش، دوژمنی سەرسەختی کتێب و گۆڤار و رۆژنامە بن، ئەگەر دەستیشیان بکەوێ ئەوە زۆر لەوە دڵنیام، کە تەنیا نانی لەسەر دەخۆن. ئەم سەد کورتیلە چیرۆکانەشی، جیهانێکی تایبەتین و لە دنیای ئەدەبی کوردیدا زۆر دەگمەن و دانسقەن و ئەویش لەم بەرهەمەیدا توانیوویەتی بوونی خۆی لەم بوارەدا بسەلمێنێ تا ئەو ئاستەی لەمەودوا هاوشێوەکانی خۆی رێچکەی ئەو بگرن و وەکو ئەویش بنووسن، بەڵام بەشێواز و دەنگ و رەنگی خۆیان نەك دووبارەکردنەوەی ئەم دەنگ و رەنگ و رێچکەیە.

ئاوێنە لە (سابیر رەشید) و لە ئێمە و خوێنەرانی پیرۆز بێت، بە ئومێدی بەرهەمی گرانبەهای دیکە.

* سەرچاوە: رۆژنامەی (خەبات)، ژمارە (۱۹۹۸)، هەینی ۹ی کانوونی یەکەم ۲۰۰۵.

# کەشی خەیاڵی لە کورتیلە چیرۆکی (گەشتێکی خەیاڵی)دا

حوسێن سابیر عەلی

وێنە و وێناکردنی کەس و بابەت و ژینگە لە چیرۆکدا، دەرخستنی لایەنی واقیع و ڕێباز و شێوەی چیرۆکەکەی لێدەکەوێتەوە. بەپێی ئەو ڕەوت و ڕێبازانەی کە چیرۆکی پێ نووسراوە، دیاری و ئاشکرایی ئەو ڕەگەز و بنیادانەی کە لە چیرۆکەکەدا هەن، گۆڕانیان بەسەردا هاتووە.

ئەو چیرۆکانەی، کە مۆرکێکی واقیعییان بەسەردا زاڵە، دەبینین زۆربەی لایەنەکانی پێکهاتنی چیرۆکەکە بەشێوەیەکی ئاشکرا هەستیان پێدەکرێ. ئەو چیرۆکانەش کە مۆرکێکی خەیاڵی و فانتازییان هەیە، بێگومان هەستکردن بە لایەنە پێکهێنەرەکانی چیرۆک و دۆزینەوەیان لە ژیانی ئاساییدا، ئاڵۆز دەکەوێتەوەو ناتوانین

بڵێین هەست بە هیچیان ناکرێ، چونکە ئەگەر نەیاندۆزینەوەو هەستیان پێنەکەین، چیرۆکەکە پێکنایەت.

چیرۆك قەبارەو شێوەی جیاوازی هەیە، وەك: (چیرۆکی زۆر کورت، کورتیلە چیرۆك، چیرۆکی کورت، چیرۆك، چیرۆکی درێژ)، ئەمانە چەند قەبارەو قالبێکی دیار و جیاوازی چیرۆکن، رەنگە جۆری دیکەش هەبن. هەر یەکێك لەمانە بنەمای تایبەتی و گشتیان هەیە، بەلاّم دەکرێ لەرووی ئاشکرایی و خەیاڵی لایەنە پێکهێنەرە سەرەکییەکانی چیرۆکدا، دەمارێکی هاوبەش لە نێوانیاندا هەبێ، دەشتوانین باس لە (خەیاڵ) وەك هاوبەشێك لە نێوانیاندا بکەین.

## خەیاڵ، لە چەمکەوە بۆ رەگەزێکی رەسەن

خەیاڵ لە ژیانی مرۆڤدا جێگەیەکی گرنگی هەیە، بە درێژایی دیرۆك و قۆناغەکانی ژیان و شارستانییەت، رۆڵێکی سەرەکی لە پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا بینیووە. ئەو داهێنان و پیشکەوتنانەی کە لە ئەمرۆی دەوروبەرماندا دەیانبینین، سەرچاوەکەی لە خەیاڵەوە هاتووە. رێژەی خەیاڵ لە ژیانی مرۆڤ ئەگەر بەراوردی بکەین بەلایەنی کارو جووڵەی، رێژەکە بەرزە، بەرادەیەك "ئەو ماوەیەی مێشکی مرۆڤ لە پرۆسە خەیاڵییەکانیدا بەسەری دەبات، بەدەیان جار لەو ماوەیە

زیاترە، کە لە کارکردنی رۆژانەی، یان لـە ژیـانی واقیعیـدا بەسـەری دەبات"[1].

خەیاڵ لە دەقی ئەدەبیدا پێگە و رۆڵێکی گرنگی هەیـە، دەتـوانین بڵێین ئەرکێکی یەکلاکـەرەوە لـە جوداکردنـەوەی دەقـی ئـەدەبی لـە رووداوی راستەقینە و مێژوویی دەگێرێـت، چـونکە "ئـەوەی رووداوی نێـو بەرهـەمی ئـەدەبی لەگـەڵ رووداوی راسـتەقینەی نێـو کۆمـەڵ جیادەکاتـەوە، لایـەنی بـەکارهێنانی خەیاڵـە"[2]، هەرچـەندە دەقـی ئەدەبی، بەتایبەتی هونەرە گێڕانەوەییەکان، زۆرجار پشت بـە رووداوی راستەقینە و مێژوویی دەبەستن، بەڵام گواستنەوەیان بەشێوەی ئاسایی خۆی، کار لەلایەنی هونەری دەقەکە دەکات. چەندە دەقە ئەدەبییەکـە لە رووداوە راستەقینە و مێژووییەکە نزیك بێت، ئەوەنـدە کاریگـەری نەرێنی لەسەر لایـەنی هونـەری دەقەکـە جێـدەهێڵێت، بـەڵام سـوود وەرگرتن لە رووداوی راستەقینە و مێژوویی و دواتر تێکـەڵکردنی بـە خەیاڵ و هەست و سۆز و جوانی، پلەیەکی بـاش بـە دەقەکـە دەدات، ئەمەش لەگەڵ ئەو بۆچوونە زۆر نزیکمان دەکاتەوە کـە چـیرۆکنووس، یان "رۆماننووس، چەند لە واقیع دوورکەوتـەوەو پـەنای بـۆ خـەون و زیندەخەون و ئەندێشـەکان بـرد، ئەوەنـدەش تێکسـتەکەی لـە واقیـع دەترازێت و لە بەرژەوەنـدی جوانسـازییەکەیدایە"[3]. بڕواشمـان بـەوە پتـەوە کـە زۆربـەی دەقـە ئەدەبییـەکان لـە بنەڕەتـدا "واقـیعین و

خەيالكردوونى بە هونەر"[٤]. لێرەدا خەيالْ رۆڵى گواستنەوە دەبينىێ. سەرەڕاى ئەمەش، رێبازى رياليزم بەو باڵادەستييەى كە لە بەرهەمى هونەرى و ئەدەبيدا هەيەتى "دژى ئەدەبى خەياڵى نييە"[٥]، بەڵكو پەسەندى دەكات و لە چوارچێوە هونەرييەكەيدا مامەڵەى لەگەڵدا دەكات. لێرەشدا ئەوە دووپات و چەندپات دەكەينەوە، كە خەيالْ لە پاڵ (سۆز، بير، واتا) چوار رەگەزى سەرەكى لە دامەزراندنى دەقى ئەدەبيدا پێكدەهێنن.

كورتيلە چيرۆكى (گەشتێكى خەياڵى)ى (سابير رەشيد)، كە لە دووتوێى كۆمەڵە كورتيلە چيرۆكى (ئاوێنە)[٦]دا بڵاوبوويتەوە كە بريتييە لە (١٠٠) كورتيلە چيرۆك. لە چوارچێوەى بۆچوونەكانى سەرەوە، ئەم كورتيلە چيرۆكە دەخەينەڕوو، ئەمەش دەقەكەيەتى و بەشێوەى خۆى دەينووسينەوە:

## گەشتێكى خەياڵى

((نووسەرەكە دواى ئەوەى (كۆميدياى خوداوەندى) دانتى خوێندەوە. ئێجگار ماندووبوو، بۆيە لەگەڵ كتێبەكە دەست لەملانێ خەوى لێكەوت، ئەو نووسەرە شەو لە خەويدا بوو بە (دۆن كيشۆت)ێك و سوارى ئەسپە شێيەكەى بوو و ئەم سەرو ئەو سەرى

دنیای تەی دەکرد، بەردەوام لە ئەستێرەو خۆر و مانگی دەپرسی و بەدوای ئەم جیهانە ونەی دانتی دا دەگەڕا))[٧].

لەم کورتیلە چیرۆکەدا نووسەر باس لە شەوێکی نووسەرێك دەکات، کە دوای ئەوەی بەرهەمی (کۆمیدیای خوداوەندی) (دانتی ئەلیگری ١٢٦٥-١٣٢١) ئیتاڵیایی دەخوێنێتەوە، بەهۆیەوە ماندوو دەبێت و خەوی لێدەکەوێت. لە خەویدا دەبێتە (دۆن کیشۆت)ی (سێرڤانتس ١٥٤٧-١٦١٦)ی ئیسپانی و دەست بە گەڕان و خولیا و خەیاڵە سەیر و سەمەرەکانی دەکات. لە بنەڕەتدا دۆن کیشۆت دەخوازێ وەك پاڵەوانی سەردەمە کۆنەکان سەرکێشی بنوێنێ و بەدوای مەبەستەکانیدا بگەڕێ و "بە مەبەستی داکۆکی و بەرگری لە شەڕافەت و ئابڕووی مرۆڤانی دەچێتە شەڕی دوژمنانی خەیاڵی"[٨]. ئەو کەسەی کە لەم کورتیلە چیرۆکەدا بوویتە دۆن کیشۆت، دەست بە گەڕان دەکات و دنیا تەی دەکات. لەبارەی جیهانە ونەکەی دانتی-ش کە لە بنەڕەتدا "سەفەرێکی خەیاڵییە بەنێو خەم و پەژارە و خۆشی و شادیدا"[٩]، پرسیار لە ئەستێرە و مانگ و رۆژ دەکات. کورتیلە چیرۆکەکە بەم شێوەیە کۆتایی دێت.

لەم کورتیلە چیرۆکەدا گەلێك لایەنی دیکەی خەیاڵی هەیە، وەك:

أ- کەسی سەرەکی کورتیلە چیرۆکەکە، ناوێکی دیار و ئاشکرای نییە، تەنیا وەك نووسەر خراوەتەڕوو، هەرچەندە بەشێوەی ناسراویی

(نووسەرەکە) خراوەتەڕوو، بەڵام ناسراوییەکەی لەوە زیاتر نییە، هیچ زانیارییەکمان ناداتێ، کە ئاخۆ ئەم نووسەرە ناوی چییە؟ لە کوێ هاتووە و دەچێتە کوێ؟.....تاد.

ب- شوێنی ڕوودانی چیرۆکەکە دیار نییە، بەشێوەیەکی نادیار بەرجەستە کراوە. هەندێ شوێن هەن، وەك: (دنیا، ئەستێرە، مانگ، خۆر)، بەڵام لەوکاتەدا بەرجەستە دەکرێن، کە نووسەرەکە خەوی لێکەوتووە و لە خەودا ئەمانە وێنا دەکات. سەرەڕای ئەمەش، ئەو شوێنانەشی کە باسمانکردن، ناو و شوێنی گشتین، نەك تایبەتی و خاوەن ناسنامەیەکی بەرجەستە و دیاریکراو.

ج- کات نادیارە، هەرچەندە باس لە شەوێك دەکات، بەڵام شەوێکی نەناسراو، نازانرێ چ شەوێکە.

د- دەستپێکردن و کۆتایی کورتیلە چیرۆکەکە لە یەك شوێنە، لە شوێنێك دەستپێدەکات و لە هەمان شوێن کۆتایی دێت. ئەو گۆڕانەشی کە لە شوێنەکە ڕوودەدات، بەهۆی خەون و خەیاڵەوەیە.

هـ- گەڕانی نووسەرەکە لە دەقی ئەم کورتیلە چیرۆکەیەدا، هەمان گەڕانی دانتی-یە بۆ دۆزینەوەی جیهانە ونەکەی، هەر تەنیا دەستەواژەی (جیهانی ون)، یان (جیهانە ونەکە)، یان (جیهانێکی ون)، لەناو خۆیدا واتاو کەشێکی خەیاڵی دروست دەکات، لە خزمەتی بنیادی هونەریی ئەم کورتیلە چیرۆکەدا شکاوەتەوە.

و- بۆ دۆزینەوەی جیهانە ونەکە، نووسەرەکە پرسیار لە ئەستێرە و خۆر و مانگ دەکات، بێ گومان وەڵام لەلای ئەمانە دەست ناکەوێت، بۆیە وەڵامی پرسیارەکەی هەر بە نهێنی و ناتەواوی و خەیاڵی دەمێنێتەوە.

بێگومان ئەم نادیارییەی هەریەك لەم خاڵانەی کورتیلە چیرۆکەکە، بەشێك لە بەرپرسیارییەتی جوانی ئەم بابەت و ناونیشانە دەردەخات، کە نووسەر کورتیلە چیرۆکەکەی لەسەر دامەزراندووە. ناونیشانی کورتیلە چیرۆکەکە بریتییە لە (گەشتێکی خەیاڵی)، بۆیە ئەم ناونیشانە ئەوە دەخوازێت، کە ئەم پێکهاتە سەرەکییانە بەم شێوەیە بن، نووسەریش باشی بەرجەستە کردوون.

لەنێو دەقی ئەم کورتیلە چیرۆکەدا، ئاماژە بە ناوی دوو بەرهەمی جیهانی کراون، ئەوانیش:

١- (کۆمیدیای خوداوەند)ی دانتی ئەلیگری.

٢- (دۆن کیشۆت)ی سێرڤانتس.

لەم دوو بەرهەمەشدا خوێنی زیندوویەتی و کاریگەری خەیاڵ بە ئاشکرا هەستی پێدەکرێت، بۆیە نووسەر لەمەشدا دوو بەرهەمی گونجاوی هەڵبژاردووە و لەگەڵ ناونیشان و بابەتی کورتیلە چیرۆکەکەی دەگونجێت. لە سەرێکی دیکەشەوە، خوێندنەوەی ئەم دوو بەرهەمە و بەرهەمی دیکەش، بۆ نووسەری ئەم کورتیلە چیرۆکە و نووسەرانی

دیکەش سوودبەخشە، کە وایان لێدەکات لە جیهانی بەرفراوانی ئەدەبدا دانەبڕێن و بەردەوامی بە کردەی خوێندنەوەو نووسینیان بدەن، چونکە "لەم سەردەمەدا ئەوەی نەخوێنێتەوە، لە بیابانێکی قاقڕدا دەژی، نە سروشی بۆ دێت و نە خەیاڵ"[١٠]، ئەم خەیاڵەش دەبێتە بناغەی سەرەتایی چیرۆکەکە، لەم کورتە چیرۆکەشدا، خەیاڵ لەسەرێك بناغەیە، چونکە دروستبوون و داهێنانی چیرۆکە لە خەیاڵێکی سەرەتاییەوە هاتووە. لە سەرێکی دیکەش پەیکەرێکی تەواوە، چونکە بەڕێوەچوونی چیرۆکەکە، بەڕێوەچوونێکی خەیاڵییە و سیمایەکی خەیاڵی بە گشت چیرۆکەکە بەخشیوە.

لە کۆتاییدا ئەوەی دەکرێ وەك خەوشێك لەم کورتیلە چیرۆکەدا سەیری بکەین، ئەوەیە کە نووسەر وا وێنای ئەسپەکەی دۆن کیشۆتی کردووە کە ئەسپێکی "شێیە"[١١]، بەلام لە بەسەرهاتەکەی دۆن کیشۆتدا ئەسپەکە "زۆر بێ هێز بوو. بریتی بوو لە ئێسقان"[١٢]، دەشکرێ وا سەیری ئەسپەکەی کورتیلە چیرۆکەکە بکەین کە داهێنراوی خەیاڵی چیرۆکنووسە و دوورە لە ئەسپەکەی دۆن کیشۆت، ئەگەر واشبێ، مافی خۆیەتی ببێتە خاوەنی ئەسپێکی شێی وا.

**سەرچاوەو پەراوێزەکان**


١- جەبار جەمال غەریب، خەیاڵ وەك پانتاییەك بۆ داهێنان، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (١٧٠) شوباتی ٢٠٠٣، ل٤.

٢- عادل مەجید محەمەد گەرمیانی، ریالیزم لە رۆمانی کوردی هاوچەرخ لە عێراقدا، نامەی ماستەر، کۆلێژی پەروەردە-ئیبن روشد، زانکۆی بەغدا، ئاياری ١٩٩٦، ل٢١٧.

٣- عەبدوڵڵا سەراج، دۆنایدۆن، یان بەد گۆڕان، چەند بابەتێك لەبارەی ئەدەبی نوێی کوردییەوە، چاپخانەی بینایی، سلێمانی، ٢٠١٣، ل٥٢.

٤- رەئووف بێگەرد، مارکیز بۆ؟، گۆڤاری (سەردەم)، ژمارە (٣٨)، نیسانی ٢٠٠٥، ل١٢٩.

٥- الدكتور سالم احمد الحمداني، مذاهب الادب الغربي و مظاهرها في الادب العربي الحديث، مطبعة التعليم العالي-موصل، ١٩٨٩، ص١٦٨.

٦- سابیر رەشید، ئاوێنە،-١٠٠ کورتیلە چیرۆکی کوردی، چاپخانەی گەنج-سلێمانی، ٢٠٠٥، لە بڵاوکراوەکانی کتێبفرشی سۆران، ژمارە ٥٥.

٧- سابیر رەشید، ئاوێنە، ل١٩.

٨- کۆمەڵێك نووسەر، توحفە نمای ئەدەبیاتی جیهانی، وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف، چاپخانەی شڤان-سلێمانی، ٢٠١١، ل٢٠٩.

٩- سەرچاوەی پێشوو، ل٣٧٠.

١٠- محەمەد فەریق حەسەن، ئەزموونی چیرۆکنووسین، چاپخانەی لەریا-سلێمانی، ٢٠١٢، ل٢٤٧.

١١- سابیر رەشید، ناوێنە، ل١٩.

١٢- سێرڤانتس، دۆن کیشۆت، وەرگێڕانی: محەمەد زەهاوی، دار الحریة للطباعة-بغداد، ١٩٨٧، ل٣٠.

سەرچاوە: گۆڤاری (رامان)، ژمارە (٢١٦) مایسی ٢٠١٥.

# ناوهێنانم له نووسین
# لەبارەی کورتیله چیرۆك

دکتۆر عادل گەرمیانی له نووسینێکی به ناونیشانی (انطباعات عن الاقصوصة الكردية)دا که به زمانی عەرەبی له ژماره (٤٤٢٩)ی رۆژی ١٩٩٠/٨/٥ی رۆژنامەی (العراق)دا بڵاوی کردۆتەوه له کۆتایی نووسینەکەیدا دەڵێ: ((ولكن رغم ما قلناه وذكرناه في هذه الفقرة فأنه لايمكننا تجاهل ذكر اسماء قصاصين كرد اجادوا وابدعوا في كتابة الاقصوصة من أمثال (عبدالله السراج، رضا سيد گول البرزنجي، صابر رشيد، عبدالله الجندي، هيمداد حسين).

(عەبدوڵڵا تاهیر بەرزنجی)یش لە ژمارە (٢)ی گۆڤاری (پڕۆژە) کە ساڵی ١٩٩١ نووسەرانی کەرکووك بڵاویانکردەوە لە نووسینێکیدا کە بەناونیشانی (القصة القصيرة جداً) بە زمانی عەرەبی نووسیویەتی دەڵێ: ((وصلتنا الاقصوصة عن طريق الادب العربي والثقافة الاوربية المترجمة في منتصف السبعينات فأنشغل بكتابتها بعض القصاصين أمثال (رؤوف حسن، احمد محمد اسماعيل، عبدالله سراج، محمد موكري، رؤوف بيگرد، و کاکەمەم بوتانی، طاهر صالح سعيد، صابر رشيد...)).

مامۆستا (عەبدوڵڵا سەڕاج)ی ڕۆماننووس و چیرۆکنووسیش لە نووسینێکیدا بەناونیشانی (بەرکوڵە سەرنجێك لەبارەی کورتیلە چیرۆکەوە) کە لە ژمارە (١٨)ی ڕۆژی ١٩٩٧/٣/٢٧ی پاشکۆی ئەدەبی ڕۆژنامەی (برایەتی)دا رای وایە کە ((سیمای سەرەکی ئەم جۆرە، کورتی و چڕیەکەیەتی کە لە هەندەراندا پێوەرەکەیان لە نێوان هەزار و پێنج سەد وشە نیشانداوە، کەچی ئەم پێوانەیە زۆربەی چیرۆکە کورتەکانی ئێمە دەگرێتەوە!! لەکاتێکدا چیرۆکی زۆر زۆر کورتی ئەوتۆمان هەیە هەرگیز لە ئەوروپا و ئەمەریکادا وا کورت نەکراوەتەوە!! بە نموونە: (شەمەندەفەر)ی (سابیر رەشید) بیست و پێنج وشە تێناپەڕێنێ و چیرۆکۆکەی (ژن)ی منیش شەست حەفتا وشەیە!)).

لە کۆتایی نووسینەکەشیدا دوای ئەوەی بە وردی لەم تەرزە نووسینە دەدوێ دەڵێ: ((دیارە رۆڵی کەسانیتریش فەرامۆش ناکەم و ئەوانیش لەم بوارەدا بەرهەمیان هەیە وەکو: سابیر رەشید و عەباس عەبدوڵڵا یووسف و رەئووف بێگەرد و کاکەمەم بۆتانی و عەبدوڵڵا جندی و ئەنوەر محەمەد تاهیر و.. کێ و کێ...)).

(د. هیمداد حوسێن)یش لە نووسینێکیدا کە بەناونیشانی (کورتیلە چیرۆك) لە ژمارە (١٨)ی رۆژی ١٩٩٧/٣/٢٧ی پاشکۆی ئەدەبی رۆژنامەی (برایەتی)دا بڵاوی کردۆتەوە لە کۆتایی نووسینەکەیدا دەڵێ: ((لەم ساڵانەی دوایی هەندێ نموونەی سەرکەوتووی باشم بە بەرچاو کەوتووەو هەندێ برادەرمان کورتیلە چیرۆکی سەرکەوتوویان نووسیوە و لەبیرو زەینمدا ماوەتەوە، عەبدوڵڵا سەڕاج، عەبدوڵڵا جندی، عەباس عەبدوڵڵا یووسف، سابیر رەشید، رەئووف بێگەرد، رەزا سەید گوڵ بەرزنجی و چەند کەسێکی دی، کە ئێستا لە یادم نین..)).

(شیرین. ك)ی چیرۆکنووسیش لە تەوەرەی چیرۆکی زۆر کورتدا کە لاپەڕەی ئەدەبی کوردستانی نوێ ئەنجامیدا لە نووسینێکیدا کە لە ژمارە (٢٣٦)ی رۆژی ١٩٩٢/١١/٨ بە ناونیشانی (بۆ کورتیلە چیرۆکمان نەبێ؟) نووسیویەتی دەڵێ: ((زۆر بەوردی هەموو ئەو نووسراوانە دەخوێنمەوە کە لەسەر ئەم مەسەلەیە بڵاوکراوەتەوە و بڵاو

دەکرێتـەوە، مەبەسـتی نووسـین و بڵاوکراوەکـانی نێـو تەوەرەکـەی (کوردستانی نوێ)ن، بەڕای مـن نووسـینەکەی (سـابیر رەشـید)، لـە ژمارە (١٩٨)دا بەناوی چیرۆکی زۆر کورت بۆچـی؟ لـە هـەموو ئـەو نووسراوانە ((کامل))تر بوو، چـونکە گـەلێك زانیـاری لـەبارەی ئـەم تەرزە چیرۆکە باس کردبـوو، کـە رەنگـە لای زۆری خوێنـەران زانـراو نەبووبێ بۆیە بە پێویستی نازانم چیتر منیش باسی سـەرەتاو چـۆنێتی ئەم جۆرە چیرۆکە بکەم...)).

(سەلاح عومەر)ی چیرۆکنووسیش هەر لە هەمان تەوەرەی کورتیلە چیرۆکدا لە ژمارە (١٨)ی پاشکۆی ئەدەبی رۆژنامـەی برایـەتی رۆژی ١٩٩٧/٣/٢٧دا لـە دوای باسـکردنی کورتیلـە چـیرۆك لـە ئـەدەبی کوردیدا دەڵێ: ((هەمانـە دەمێکـە خـەریکی نووسـینی ئـەم تـەرزە نووسـینەیە وەك: (عـەباس-عەبـدوڵلا یووسـف، عەبـدوڵلا سـەراج، رەئووف بێگەرد، سابیر رەشید، ئاسـۆ حەسـەن، و چـەندانیتر)، بـەلام هێشتا بە تەواوی خۆیان بۆ تەرخان نەکردووە، من خۆم حەز بەم جۆرە نووسینە ناکەم چونکە پێموایە جارێ ماومانە، بـەپێی ژمـارەی ئـەو کەسانەش، کە خـەریکی نووسـینی کورتیلـە چـیرۆکن پێناسـەی بـۆ دەکرێت...)).

# پاشبەندی دووەم

## لێدوان و وەرگێڕانی کورتیلە چیرۆکەکانم

## بۆ زمانی عەرەبی

# ملحق

## قراءات نقدية و ترجمة القصص الى اللغة العربية

* تێبینی: هەندێك لەم كورتیلە چیرۆكانە پێش ئەوەی لەم كتێبە چاپ بكرێن، لێرەو لەوێ لە گۆڤار و رۆژنامەكاندا بڵاو كراونەتەوەو برایانی نووسەر وەریانگێڕاوە، بۆیە مێژووی پێش دەرچوونی كتابەكەیان هەڵگرتووە.

# لماذا الاقصوصة الكردية؟

صابر رشيد

ترجمة: عبدالخالق كريم البرزنجي

عوضاً عن المقدمة، لماذا الاقصوصة الكردية؟

مع وجود اختلافات في الاراء ووجهات النظر المتباينة بصدد هذا الضرب من القصة القصيرة هنالك شعور بوجود هذه الظاهرة كضرب من ضروب كتابة لها حضورها اليوم في الادب العالمي ولها قراؤها المرتبطون بها. لقد انبلجت الاقصوصة منذ فترة قصيرة مع تباين الاراء حول بدايات هذه الخطوة، فهناك من يسترجعها الى القاص تشيخوف، او الى ناتالى ساروت، او الى كافكا، او الى مجموعة من مشاهير كتاب القصة، على اية حال فظهور هذا النمط من الادب تعود بداياته الى نهاية القرن العشرين، وبفعل تأثراته انتقل الى

الادبين العربي والكردي بالرغم من شيوع هذا النوع من الكتابة كنوع من انواع الحكايات الشعبية في المجتمع الكردي في قديم الزمان جنباً الى جنب الاداب العالمية، حيث توجد في خزائن تراثنا الشعبي حكايات قصيرة جداً شبيهة بمثل هذا الموضوع الادبي، الا ان اسلوب كتابة الاقصوصة من حيث التكنيك والابداع واللغة والصياغة الحديثة تطور تحت تأثير الدول الاوربية الى ان وصل الى يومنا هذا والتي تعود بداياتها في الادب الكردي الى سنوات السبعين من القرن المنصرم.

ليس مهماً من هو القاص المبادر بهذا الخصوص، فاذا اراد الكاتب بيبلوغرافيا القصة استكناه جذور هذا النمط من الادب يستطيع في ذلك الوقت ان يعين او يحدد المبادر الاول في هذا المجال.

لقد ظهر هذا الطراز من الكتابة في معترك الادب الكردي كموجة حداثوية لتحقيق امال وتطلعات عصر السرعة وتطورات التكنولوجيا -بجهود علمائها الذين يمتلكون ناصيتها- لكي يقوم بتحجيم الام الحياة اليومية ومخاضات الانسان المعاصر كل حسب ظروفه المختلفة وصياغتها بهذه الكتابات المختصرة كما ذكرناها آنفاً، لهذا السبب تم تسميتها بسميات عديدة، فعلى سبيل الامثلة: سميت بـ(الهامبورغر) من قبل احد الكتاب العرب المعروفين لكونها يتم هضمها بسهولة وسرعة، وقد سماها احد اخر بـ(حزمة الضوء)، وهناك من سماها بـ(لوحات شعرية)، واخر بلوحات كاريكاتيرية وتشبيهات

اخـرى مختلفـة... الخ الى ان اسـتقرت اراء الاغلبيـة علـى تسـميتها بـ(القصة القصيرة جداً)، ولكن في الادب الكردي لم يستقر الامـر علـى تسـمية موحـدة بعـد بـل سميـت بمسـميات متنوعـة منهـا: ((القصـة القصيرة جداً، الاقصوصة، القصيصة، الميكـرو قصـة، القصـة العـابرة، قصص يومية، ملاحظات قصصية، قصـص بوسـترية..)) بينمـا يقـف بعض الاخوة كتاب القصص على النقيض مما ذكر، حيث يـرون في هـذا النمط من القصة تراكم جهود مضنية لكاتب القصة منهـا: احتكاكـه المستديم مع الثقافة العالمية والمستجدات الفنية، وكذلك قيامه بسـبك وصياغة لغوية وشعرية مكثفة لاستيعاب او هضـم حـالات او مواقـف الانسان في بوتقة لغة ميسرة وبديعة، واخيراً ولـيس اخـيراً تعـبيره عـن لوحات وجمل مختصرة ذوات معان عميقـة، واخـيراً اسـتخدامه اسـلوب كتابة التكنيك المعاصر، ومن جانب اخـر هنـاك انـاس يتصـورون بـأن كاتب القصة بامكانه كتابة العديد من هذا الضرب من القصـة يوميـاً كمن يقوم بتحرير النكـات والاقـوال المـأثورة والخواطر بـدون زيـادة او نقصان، ولكن من الناحية الفنية يعتبر هذا الطراز من القصـة اصـعب بكثير من كتابة القصة الاعتيادية او القصـيرة كمـا اعـترف بـه كتـاب القصة الكبار، فمن المهم لدى الكاتـب هـو: ان يجعـل القـاريء تتكـون لديـه بعـض الملاحظـات وعلامـات اسـتفهام اثنـاء شـروعه بقـراءة الاقصوصة لكي ينجذب للقراءة ويستشعر بحدوث شـيء مـا، او يقـوم

كاتب القصة بفك لغز كبير فيها لوضع القاريء في موقف مستغرب او مندهش ام يتوقع حدوثه المفاجيء.

من المحتمل وفي احايين كثيرة ترك نهاية الاقصوصة للقاريء للوصول الى الحقيقة بنفسه حيث يمهد الكاتب الطريق لصياغة جملة مكثفة للمتلقي ليجعله يستدرك معه بداية ونهاية وفحوى الاقصوصة، لاشك ان هذا الطراز من الكتابة يعتبر خطوة لبروز ادب طليعي تقدمي يمهد الطريق-مثل شعر الهايكو والبوسترات الشعرية- ليكتب للانسان الذي يعيش في معمعة هذا العصر وليصبح الحجر الاساس للادب المعاصر والانسان المثقف المعاصرين، ذلك الانسان الذي يحبذ ان يطالع هذا النمط الجديد من الكتابة السليقية في اقصر وقت ممكن والقيام بتحليل مكامن وتوجهات كاتب القصة علاوة على محاولة تلقيه ملخص المواقف الانسانية مستأثراً بعلامات الاستفهام التي تتشكل لديه على الاقل.

انا اتناقض مع اولئك الذوات الذين لايضعون الاقصوصة في خانة القصة، لذا كان اهتمامي الشخصي بهذا النمط من القصة جاء كنوع من حب جنوني ولوجود مواقف انسانية كثيرة نراها بالعين المجردة او نتحسسها يمكن تلخيصها بصورة مكثفة وعرضها على القاريء دون اللجوء الى الاطناب.

كما يجب ان تكون هذه الكتابات متضمنة لوحات فنية موجزة وجميلة لكي يزين الادب الكردي بحلة مزركشة كجزء من الادب العالمي، احياناً كثيرة نرى الشعراء يعبرون عن لوحاتهم الشعيرة بقصيدة بوستريه او برباعية او مثنوية...الخ من المحتمل ان تدخل الاكثرية منها في اطار الاقصوصة.

اذن لماذا ذلك الذي يحق للشعر لاتستحقها القصة؟! وذلك لكون هذه الاقصوصات اسهل طريقة للوصول الى ذهن المتلقي، لذا انا من جانبي اتعامل بلهفة وشوق مع الاقصوصة ولا استطيع ان اتغاضى عن هيامي الشديد لهذا النمط من الكتابة، فلتكن لها موطيء قدم وتسد ثغرة في ميدان الادب الكردي لان وجودها خير من عدم وجودها.

* المرآة، مائة اقصوصة كردية، صابر رشيد.

المصدر: مجلة (الصوت الأخر)، العدد (١١٠) الأربعاء ٢٣ آب ٢٠٠٦.

# قراءات في النص الادبي الكردي

عبدالزهره الركابي

في القصــة القصــيرة او الاقصوصــة يكــون دور الحشــد الصــوري او التكثيف الموجز عاملاً مهماً في توصيل الفكـرة المنشـودة. اذ أن هـذا الجنس من الادب يعتمد في الاساس على الوضوح مع تداخل الرمـز في حدث القصة. وبالتالي جعل محورها يتسع لاجتهادات الكاتـب وصـولاً للغرض الذي يبتغيه.

وقد تحـث القصـة القصـيرة او الاقصوصـة الكرديـة منحـى ذا بعـد يستشف مكامن الايقـاع الانسـاني وتوظيفـه باسـلوب خـاطف يتسـم بطابع التشويق والجذب.

والفن القصصي الكردي كان سباقاً في ولوج مضامير لم تكن شائعة بالنسبة لفن القصة العراقيـة. ونسـتطيع القـول ان القـاص الكـردي في كتاباته استخدم تقنيات متطورة. وهذا يعود لمتابعاته المتواصلة وبحثـه

الـدؤوب في مناهـل الادب العـالمي وبالـذات منهـا الادب القصصـي والروائي.

ان القصة الكردية في مجمل سياقها العام تناولت حـالات انسـانية. ومن خلالها اسـتطاعت ان تلـج عـوالم جدليـة مازالـت حتـى الان غـير محسومة. وان تعددت الاجتهادات والرؤى في هذا المجال.

وتوكيداً لما تطرقنا اليه سلفاً فان القصـة الكرديـة تناولـت جوانـب معقدة. وحاولت من خـلال هـذه الجوانـب ان تسـتفيد مـن التـداعيات الذاتية في سياق مباشر وصولاً الى تسليط الضوء على هـذه الجوانـب وبالتالي جعلها مالوفة ومعتادة عند القاريء او المتذوق.

وتكون اقصوصة (الهامش) الانموذج الذي ينطبـق علـى مـا ذكرنـاه من ناحية التوفيق بـين البدايـة والنهايـة، هـذا شـيء والشـيء الاخـر اظهرت لنا هذه الاقصوصة بعض الحـالات الـتي تتعلـق بمجـال الثقافـة والادب، اذ ان (الهـامش) هـي بمثابـة شـهادة ادانـة للظـواهر السـلبية الموجودة في الوسط الثقـافي، بـدليل ان هـذه الاقصوصـة اشـارت اليهـا بشـكل دقيـق. واظهـرت بعـض النمـاذج الصـغيرة في واقعهـا الا ان حساسيتها لها دور طاغ في هذا الوسط.

ومـن هـذا نسـتطيع القـول انهـا اقصوصـة موفقـة في سـردها وفي نهايتها مثلما في بدايتها، لأنها استطاعت ان تلم بالاحداث وفق رؤيـة واقعية ولها جذر في واقعنا الحسي، فهي تعطي انطباعاً جيـداً عـن فـن

القصة القصيرة الكردية التي هي احدى الركائز المهمة في عماد القصة العراقية المعاصرة.

(١) اقصوصة الهامش، كتابة صابر رشيد، ترجمة عادل گەرميانى، افاق كردية، جريدة العراق، ١٩٩١/٣/٥.

المصدر: جريدة (العراق)، الثلاثاء، ١٦ نيسان ١٩٩١.

# في القصة الكردية المعاصرة
# القصة القصيرة جداً.. وخطوات الصنعة الواعية!!

شوقي كريم حسن

قد تكون التجربة الانسانية بمختلف اصولها، وما تتخذه من مسارات مصدراً اساسياً لعملية الخلق الادبي، الذي مايلبث ان يتخذ شكلاً جماعياً، مادامت تلك التجربة تشكل فعالية جماعية تستطيع التفاعل والخطوط العامة لتشمل بصورها الجوانب الارثية المكونة لخصوصيات عقل المتلقي.. الذي يعتقد ان الادب، وهذا ينطبق على القصة القصيرة بوصفها فناً قادراً على مخاطبة الذات الانسانية بكم من المكونات العرضية الخالقة للنص القصيقي، يكون والحالة الانسانية ((وهنا لايمكن ان تنشطر الذات انشطاراً ادبياً، اي لا يمكن للمتلقي الفصل بين لغة القص والتجربة وبعض من خصوصياته الارثية، فالمتلقي مثلاً يعتقد ام مدحت بطل رواية (الرجع البعيد) قريب جداً

الى ذاته بل هو اقرب مــن كـريم.. وهـو المحـور الاساسـي وهنـا يكـون الانجذاب والتطـابق وليـد الشـرعية التطابقيـة الخاضـعة لمعـايير نفسـية واجتماعيــة وسياســية.. والمتمــردة العــاجزة عــن رؤيــة الحيــاة علــى حقيقتهـا، والمدركـة لقـوانين الفهـم الداخليـة والخارجيـة، ولعـل القصـة القصيرة اكثر الانواع الادبية مطابقة لهذه المفاهيم والقوانين، لانها تهدد المتلقي لحظة بدء القراءة بالغاء ذاته وتكوين بديل قياسي محض ينتهي عند نهاية النص، لتبدأ مرحلـة اخـرى، تضـيف للـنص والمتلقـي معـاً سلوكية سكونية، حيث ينتهي النص الى ثبات خالد، وينتهي المتلقـي الى تجريد فهمي ليبقى في ذاكرته قياسياً، يعاود الظهـور كقـوة فاعلـة حين يحاول المتلقي الولوج الى ذات البطل ساحباً منـه حريتـه وتكوينـه الوجودي، حدث هذا كـثيراً في القصـة العراقيـة ((الكرديـة والعربيـة)) حين تقاسم القاصون بطل ((كامي)) في روايته ((الغريب)) واضعين هذه الشرائح الصورية امام المتلقي وكأنهـا فعـل قصصـي عراقـي بحـت ولا يمكن ان نستثني القصة في اقطار الوطن العربي ايضاً، ولعل هذه الحرية هي ايضاً التي جعلت القاصين العـراقيين ((الكـرد والعـرب)) يتخـذون القصة القصيرة جداً، نمطاً ادبياً جديداً، رغم اعتقـاد الـبعض مـنهم ان هذا النوع من الكتابـة لا يمكـن ان تكـون ذا تـاريخ ادبـي عريـق، ولا يمكنه ايضاً الايفاء بمقومـات القصـة القصـيرة الـتي اعتادهـا المتلقـي واطمان لحقاتها الداخلية ولقيمها ذات الابعاد الحضـارية، وهنـا تبتعـد

القصة القصيرة، عن القصيرة جداً مـن ان الاولى القـادرة علـى تحقيـق معادل قصصي مبني على وحدة الوجـود، القلـق، الاعـراف باشـكالها المتعارفة، الحلم بصفته الخالق الاساسي للفعل الكتابي، الحب والطفولـة اللذين لا يمكن لكتاب القصـة لقصـيرة الاسـتغناء عنهـا ابـداً واخـيراً الشيئية التي انتقلت الى القصة القصيرة مـن الروايـة.. وحسـب وعـي القاص ودرجة معرفته بالغائية الكتابية الفارزة لكل ماهو ذاتـي عمـا مشكل للقيم ولعـل هـذا يؤشـر القـدرات المعتمـدة مـن قبـل القاصـين لكاتبة فن لم يترسخ بعده، ولم يعتده المتلقي بصفته فناً تامليـاً يسـتطيع تنظـيم الـذات داخليـة تحـرر الفكـر وتحـدد اسـتمرارية تسـلمه للوقـائع الحياتية العامة.

وللقصة القصيرة جداً ثمة قـوانين، خلقـت بعـد ان تأكـد للقـاص ان وجهات النظر المطروحة قد نمت واصبحت قادرة على تأسيس قواعـدها التي لايمكن التخلي عنها بل يمكن امتلاكها والاندماج معها اندماجاً كلياً.. فهـي ((اي القصـة القصـيرة جداً.. قائمـة علـى اسـس بنائيـة داخلية متخلية عـن طـول القصـة القصـيرة ومعتمـدة المفارقـة والاداء الفني والتقابل والتكثيف وتماسـك الحـدث والـتفجير الختـامي الباعـث للضوء.

ولعل القصة القصيرة جداً، لم تأخذ حيزاً كبيراً لدى القاصين الكـرد. لأنها كا اسلفنا فن لم يستطع بعد الرسوخ لاعتماده بديلاً يصنع المتلقي

صاحب الارث الوجداني المبني عاى خصوصيات قصصية ملحمية.. ولسوف نحاول هنا دراسة بعض من قصص هذا الملف الذي اعتقد انه اول ملف للقصة القصيرة جداً التي يكتبها القاصون الكرد.

تمتاز قصص عبدالله سراج الثلاث، اكتشاف الذات، الاحتراق، الغرور، بأنها وضفت الحكاية الشعبية الارثية المكتوبة بناء نص قصصي لكن القاص اغفل شيئاً مهماً هو تلك الخطابية المعاصرة، فبنى قصصه الثلاث بلغة تراثية معتمداً انه يخاطب المتلقي من الماضي مادام المتلقي قد عرف ان عبدالله سراج قد استمد اجواء قصصه من كتاب ((منطق الطير))، لفريد الدين العطار، وقد عزف عن وضع تكوين حديث للمفاهيم الماضوية وللغائية التي يمكن للمتلقي الخروج بها بعد ان عرف ان المنطق الاول يشكل لديه غير ارث استنتاجي فيما يشكل لديه النص المعاصر فكراً ناشئاً عن نظرة حياتية اعطت للقصة القصيرة جداً سلطة و مباديء وجهة نطر، ولا اعتقد ان المترجمين مكرم الطالباني وعادل گەرميانى غافلان عن هذه الحقيقة التي كان عليهما الانتباه لها وصياغة النص صياغة معاصرة الغرض منها امداد المتلقي بصورة تخلصه من القوالب المتجمدة والتي اظن ان لغة الكرد بحاجة ماسة الى الخلاص منها.

ويؤكد القاص ((صابر رشيد)) في قصته ((المقارنة)) على وحدة الموضوع التي لا ادري لم ذكرتني بمقولة لهيدغر وفي الواقع اليومي

يعيش الانسان في حالة نكره.. انه مشتت في المهمات العادية التي تقنع كيانه، يعيش بصورة غير صحيحة ليس هو نفسه، ان هذا السقوط في الحالة غير الصحيحة ليس امراً لا مناص منه، وعلى الاقل القلق الذي يهوي بأهمية العالم العادي الى الفناء-افاق الفكر المعاصر، فقد هوى القاص بالعالم الى وحل استذكاري شل افكاره واحال المتلقى الى كم من القلق غير المستساغ والى غثيان عدمي، ما لبث ان بدد المشعد القصصي ووضع المتلقي-الرواية- القاص في دوامه لم تقدر على ايجاد ايما تبرير فني لما حدث.

تلك هي بعض الملاحظات على هذه القصص والتي اظن ان القاصين الكرد قادرون على رفد القصة العراقية بفن ادبي لم يستطيع بعد تثبيت اركانه، ولم يقنع المتلقي بأنه فن قادر على الولوج الى اعماقه وتسمية الاشياء بمسمياتها الحقيقة..!

ولاذكر بقول ارتور (ان الكتابة وحدها هي طريق التنفيس الضروري للخروج من دائرة الحياة الرتيبة للتعلق بالاحلام!!).

**المصدر: جريدة (العراق)، الثلاثاء ٢٣ نيسان ١٩٩١.**

